

# پوختەیەك دەربارەی
# راگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی

ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی

چاپی یەكەم

١٤٢٩ك ٢٠٠٨ز




ناوی کتێب: پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی

نووسینی: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی

ژمارەی سپاردن: (٢٤٥٢) ساڵی (٢٠٠٨)

شوێنی چاپ: خانەی چاپ و بڵاوكردنەوەی چوارچرا

نۆرەی چاپ: یەكەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٨

نەخشەسازی بەرگ: فازل قەرەداغی

نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی

لە بڵاوكراوەكانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٤٢)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com



بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

﴿قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (يوسف: ١٠٨)

**پێشکەشە بە:**

. دایك و باوکم.

. هاوکارانم لە ڕاگەیاندن.

. هەموو ئەو مامۆستایانەی وشەیەکیان فێرکردووم.

. خوێنەری بەڕێزی ئەم کتێبە.

# پێشەکیی

مرۆڤایەتی ئەمڕۆ لە چەرخێکدا دەژی کە ڕاگەیاندن گشت سنوورەکانی بەزاندووەو بەهۆی تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی سەردەمەوە ڕێگا دوورەکانی کورت کرۆدتەوە، کە لە دوورترین شوێنەوەو بە خێراترین شێوە هەواڵو زانیاری بۆ خەڵك دەگوازێتەوە، ئەمڕۆ هەموو شتێك پێویستی بە ڕاگەیاندن هەیە، هەموو چالاکییە سیاسیو کۆمەڵایەتیو سەربازیو ئابووریو ڕۆشنبیرییەکان، لە ڕێگەی هۆکانی ڕاگەیاندنەوە دەگەن بە کۆمەڵانی خەڵك، ڕاگەیاندن کاریگەریی بەرچاوی لەسەر ژیانی تاكو کۆمەڵو لەسەر بیروبۆچوونو تێڕوانینەکانیان هەیەو ڕۆڵی فرەشی هەیە لە گۆڕانو دارشتنی بڕیاری سیاسییدا.

زۆر گەلو نەتەوەش توانیویانە بەسوود وەرگرتن لە تەکنەلۆژیای نویێ، دەزگاو هۆکانی ڕاگەیاندن بقۆزنەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیانو بەدیهێنانی ئامانجو خەونو خولیاکانیان و هەوڵدان بۆ ڕازیکردنو ڕاکێشانی سۆزی ڕای گشتی جیهانی بەلای خۆیانو کێشەکانیانو مسۆگەرکردنی هاوکاریو پیشتیوانی لێکردنیان.

بەپێی ئەوەندە زانیاریو ئەزموونەی لە بواری ڕاگەیاندندا هەمانە بە حوکمی کارکردنمان لەو بوارەدا کە ئەم نامیلکەیەش بەرهەمی خوێندنەوەو ئەزموونی چەند ساڵەمانە لە ڕاگەیاندن، پێمانوایە دەبێ پەیامی ڕاگەیاندن بە مەسئولیەتەوە ئەدابکرێو ڕاگەیاندنکار، یان ئەو کەسەی لە بواری میدیادا کاردەکات، پێویستە کارەکەی پەیوەست بکات بەبەرپرسیارێتییەوە و ڕادەی سەرکەوتنیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە تا چەند لە واقیعو ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییە تێ دەگات کە کاری ڕاگەیاندنی تێدا دەکات، یان پەیامەکانی ڕاگەیاندنی ئاراستە دەکات، واتە ئەو کاتە توانیویەتی بە ئەرکی ئیعلامی خۆی ڕابێتو کارەکەی بەهاو بایەخی هەبێ کە لەگەڵ ڕۆحو ویژدانی گەلدا قسە بکاتو پانتایی ئازادی لە چوارچێوەی بەهای کۆمەڵایەتیو بەرپرسیارێتی ئەخلاقییدا جێ بکاتەوە، ئازادی ڕەهاش لە هیچ شوێنێکی دنیادا نییەو ئەوەی هەیە لە چوارچێوەی یاسادایەو یاسا ڕێو شوێنی دیاری کردووە.

قەڵەم یەکەم ئامرازی ڕاگەیاندنە و خوای گەورە سوێندی پێ خواردووەو ڕێزی بۆ داناوەو سورەتێکی قورئانی پیرۆزی بە ناوی (قەڵەم)ەوە ناوناوەو لە یەکەم ئایەتیدا دەفەرموێ: (ن

**وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ** (القلم: ١). واته: نوون، سوێند به پێنووس‌و ئه‌وه‌ش دێته نووسین. یانی ئه‌و دێڕانه‌ی به قه‌ڵه‌م ده‌نووسرێن، ئه‌مه‌ش گرنگی و بایه‌خی راگه‌یاندن ده‌رده‌خات، بۆیه هه‌قی خۆیه‌تی له‌سه‌ری بووه‌ستین‌و لێكۆڵینه‌وه‌ی له‌سه‌ر بكه‌ین.

ئه‌م نووسینه، هه‌نگاوێكه بۆ ناساندنی راگه‌یاندن به گشتی‌و راگه‌یاندنی ئیسلامیی به تایبه‌تی‌و روونكردنه‌وه‌ی چه‌ندین بابه‌تی په‌یوه‌ست به راگه‌یاندنه‌وه، له‌وانه‌ش: په‌یوه‌ندی نێوان راگه‌یاندن‌و سیاسه‌ت‌و شێوازو كاریگیه‌رییه‌كانی راگه‌یاندن‌و رای گشتی‌و راگه‌یاندن... ئومێد ده‌كه‌م كه‌لێنێك له كتێبخانه‌ی كوردییدا پڕ بكاته‌وه‌و سوودێكیش به كارایانی بواری راگه‌یاندن‌و خوێنه‌رانی بگه‌یه‌نێت.

**ئه‌حمه‌د وه‌رتی**
**هه‌ولێر**
**٢٠٠٧/٥/٦**

# بەشی یەکەم:
# بنەما گشتییەکانی ڕاگەیاندن

## چەمکی ڕاگەیاندن

### پێناسەی ڕاگەیاندن لە ڕووی زمانەوانییەوە:

وشەی ڕاگەیاندن (الإعلام) بە واتای گەیاندنو بەئاگاهێنان، ئاگادارکردن، هەواڵ دان دێت،[1] دەوترێ: (أَعْلَمَهُ الأمرَ وبالأمرِ: أَطْلَعَهُ عليهِ)،[2] واتە: کارەکە، یان شتەکەی پێ ڕاگەیاند، بەمانای لێی ئاگادارکردەوە.

هەروەها ڕاگەیاندن (الإعلام)[3] بە مانای (زانین) دێت، چونکە لە (عیلم)ەوە هاتووە، کە پێچەوانەی (نەزانین)ە.

چەند وشەی تریش هەن لە زمانی عەرەبیدا مانای ڕاگەیاندن دەگەیەنن،[4] وەك (أذن)، وەك (أذن بالشيء، إذنا، و أذانا وأذانة)، واتە: زانی، لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: (فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ)[5] واتە: لەسەر زانینو ئاگایی بن. ئایەتەکە واش مانا کراوە کە: (بەهەرکەسێك واز نەهێنێ لە خواردنی سوو (ریبا) ڕابگەیەنن بەشەڕێك لە لایەن خوداو پێغەمبەرەکەیەوە).

---

1 - حسن عمید: فرهنگ عمید، مؤسسه إنتشارات أمیر کبیر، چاپ بیستو ششم، تهران، ١٣٨٢ﻫ ش. ص١٦٧.

2 - منجد الطلاب، فؤاد أفرام البستاني، ط١٨، دار المشرق، بيروت (ساڵی چاپکردنی لەسەر نییە)، ص٤٩٥.

3 بڕوانە: معجم الصحاح للجوهري، ط١، دار المعرفة، بيروت، ١٤٢٦ه، ٢٠٠٦م، ص٧٣٨ـ ٧٣٩. معجم القاموس المحيط للفيرزو آبادي، ط٢، دار المعرفة، بيروت، لبنان، ١٤٢٨هـ ٢٠٠٧م، ص٩٠٧.

4 هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، یەکەمیان ل٣٥، دووەمیان ل٣٩، ٤٠.

5 سورەتی (البقرة: ٢٧٩).

(وآذَنَهُ الأمر) أي أعلمه، واته: پێی ڕاگەیاند، (وآذنتُهُ) أي: أعلمته، واته پێم ڕاگەیاند. (والآذان: الإعلام) واته: بانگدان بە مانای ڕاگەیاندنە، بانگی نوێژیش مەشهورە.

ئەگەر سەیری مانای زمانەوانی (الدعوة)[1] بکەین، دەبینین واتای بانگکردن بۆ بەشداریی لە شتێك دەگەیەنێ، وە هەوڵە گوتاریو کردارییەکان دەگەیەنێ کە دەدرێن بۆیەدیهێنانی ئامانجێك یان کارێك، کاتێك سەیری مانای زمانەوانی ڕاگەیاندن (الإعلام) یش دەکەین، هەمان واتامان دەست دەکەوێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەردووکیان لەڕووی زمانەوانییەوە یەك مانا دەگەیەنن‌و جیاوازییان نییە لەلایەنە تەبلیغییەکەوە.

هەروەها چەمکی وشەی (بلاغە)ش لە زمانی عەرەبییدا لە چەمکی نوێی پرۆسەی پەیوەندیکردن نزیك دەبێتەوە، چونکە پەیوەندیکردن بریتییە لەو (پرۆسەیە کە ئاڵوگۆڕی واتاو تێگەیشتنەکانی لەنێو تاکەکاندا تیادا ئەنجام دەدرێت لە ڕێگەی بەکارهێنانی سیستمی ئاماژە باوەکاندا).[2]

وشەی (البلاغ) لە (الإبلاغ والتبليغ)ەوە هاتووە، کە (القاموس المحيط) هەردووکیانی بە مانای گەیاندن (الإيصال) هێناوە.[3] وە ڕاگەیاندن (شێوەیەکە لە شێوەکانی پرۆسەی پێکگەیشتن ـ کۆمیۆنیکەیشن Communication) کە لە بەرامبەر مانای (Information) دێت کە واتای (زانیارییەکان) دەگەیەنێت.[4]

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە وشەی ئیعلام لە زمانی عەرەبیدا چەند مانایەك لە خۆ دەگرێت، هەندێ جار لەیەك نزیك و هەندێ جاری تر لەیەك دوور، کە بەپێی چەمکی نوێ‌و هاوچەرخانەی، ڕاگەیاندنی ڕووداوەکان و هەواڵدان، و گێڕانەوەو ریوایەت‌و هەواڵ‌و نووچە

---

[1] سەیری: تيسير محجوب الفتياني ـ مقومات رجل الاعلام الاسلامي، بكه، ط1، عمّار، عمّان، ١٤٠٨ه، ١٩٨٧م، ص٢٢.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

[3] القاموس المحيط، الفيروز آبادي ـ سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٩.

[4] هەڤاڵ ئەبوبەکر، ڕاگەیاندن‌و ڕاگەیاندنی کوردیی، چاپی یەکەم، ناوەندی ڕۆشنبیر، سلێمانی ، ٢٠٠٢، ل١٠.

دەگەیەنێ، هەروەك ئاماژە دەكات بە ڕێنمایی **(الإشارد)** و ئاراستەكردن **(التوجیە)**و بانگەشە كردن **(الدعایة)**، واتە ئەو مانایانەش لەخۆدەگرێ.



## پێناسەی ڕاگەیاندن لە ڕووی زاراوەییەوە:

ڕاگەیاندن زۆر پێناسەی بۆ کراوە لەلایەن زانایانەوە، کە ئێمە لێرەدا دیارترین و بەناوبانگترین ئە و پێناسانە باسدەکەین:[1]

١ـ ئوتوجروت بەم شێوەیە پێناسەی ڕاگەیاندن دەکات: (ڕاگەیاندن بریتییە لە گوزارشت کردنێکی بابەتیانە لە عەقڵیەتی جەماوەر، و لە ڕۆح و خواست و ئارەزوو و ئاڕاستەکانی لە هەمان کاتدا).

بەپێی ئەم پێناسەیە، ڕاگەیاندن گوزارشت (تعبیر) کردنێکی بابەتیانەیە، نەك خودی لە لایەن ڕۆژنامەوان یان بێژەری ڕادیۆ و تەلەفزیۆن یان سینەماکار..، کەوابوو ڕاگەیاندنکار هیچ مەبەستێکی دیاری کراوی لەو شتانەدا نییە کە بڵاوی دەکاتەوە بەناو خەڵکدا ـ کە چەند ڕاستییەکی ڕووتن ـ و ئەو تەنیا مەبەستی خودی کارە ڕاگەیاندنەکەیەو بەس. بەڵام واقیع پێچەوانەی ئەم ڕایەمان بۆ دەسەلمێنێ، چونکە بێژەر، نووسەر، ڕۆژنامەوان، و هونەرمەند لەوەی دەینووسێ و بڵاوی دەکاتەوە، تەنێ گوزارشت لە ناخی خۆی ناکات، چونکە ئەو گوێزەرەوەی ئەو شتانەیە سەرچاوە ئەسڵییە ئیعلامییەکە پێی ئەدات، نکوڵیش لەوە ناکرێت کە ئەو کەسە لە پێناو بەدیهێنانی بەرژەوەندی و ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیدا کار دەکات (لێرەدا قسە لە حاڵەتە گشتییەکەیە)، باشترین بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە کاریگەری دەسەڵاتداران و سەرمایەدارو خاوەن کۆمپانیاکانە لەسەر ڕاگەیاندن و ڕەوت و ئاراستەکەی.

بۆیە دەکرێ بڵێین ڕاگەیاندن لە ڕووی واقیعەوە زاتییە نەك بابەتی، ئەمەش بە پێچەوانەی ڕاگەیاندنی ئیسلامییە، چونکە ڕاگەیاندنکاری مسوڵمان (نووسەر، ڕۆژنامەوان، پەیامنێر) کاتێك ڕای خۆی لەمەڕ بابەتێك ئەدات، ئەوا ڕەچاوی بنەماو ڕێنماییەکانی ئیسلام دەکات و هەر هەواڵ و بابەت و دەربڕینێك ڕۆژنامەوانی مسوڵمانی ڕاستگۆ بڵاوی دەکاتەوە، خۆی دائەماڵێ لە خود، ئەمەش بە سوود وەرگرتن لەسەرچاوەکانی ئیسلام، بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێ: (إن عليك الا البلاغ)[2]، (إن أنت إلا نذير).[1]

---

[1] بۆ ئەم پێناسانە بگەڕێرەوە بۆ: تیسیر محجوب الفتیانی – سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤ـ ٢٨.

[2] سورەتی (شورا: ٤٨).

هەر قورئانی پیرۆز لە چەندین هەڵوێستدا رەخنەی لە پێغەمبەر (ﷺ) گرتووە، لەوانە بەسەرهاتەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتومو مەسەلەی دیلەکانی بەدرو هی تر، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە راگەیاندنی ئیسلامیی راگەیاندنێکی بابەتییە، نەك خودیی.

٢ـ دکتۆر ئیبراهیم ئیمام لە پێناسەی راگەیانندا دەڵێ: "بریتییە لە گەیاندنی دەنگو باسی راستو دروستو زانیارییە تەواوەکانو راستییە چەسپاوەکان بە خەڵك کە یارمەتییان ئەدات لەسەر دروستکردنی رایەکی دروست لەمەڕ هەر رووداو یان گرفتو مەسەلەیەکدا، بەشێوەیەك کە ئەم رایە ببێتە گوزارشتێکی بابەتی لە خواستو عەقڵیەتو ئاراستەکانی جەماوەر". ئەم پێناسەیە لە هی یەکەمەوە نزیکە.

٣ـ هەندێکی تر لە زانایان ئاوا پێناسەی راگەیاندنیان کردووە کە بریتییە لە: "شێوازی رێکخستنی بانگەشەی سیاسی، یان بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونەکان لە ناوەندو ژینگەیەکی ئامادەکراو لە رووی دەروونییەوە بۆ پێشوازی ئەو شەپۆلە فیکرییانەی سەرچاوەکانی دەسەڵات تەکانیان پێ ئەدەن، ئەو سەرچاوانەی کە تەحەکوم بەرای گشتی دەکەنو دەیجولێننو بە دەستێکی پۆڵایینیشەوە جڵەوی دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرتووە".

ئەم پێناسەیەش زیاتر بەسەر راگەیاندنی وڵاتانی پێشووی کۆمۆنیستی و هەندێ وڵاتی دیکەی هاوچەرخیشدا دەچەسپێ کە بە ئاگرو ئاسن فەرمانڕەوایی دەکەن.

٤ـ هەندێکی تریش پێناسەی راگەیاندن دەکەن بەوەی کە بریتییە لە "بڵاوکردنەوەی لە رێگەی راو بیروبۆچوونو راستییەکان لە نێوان جەماوەری کۆمپانیا یان دامەزراوەیەکدا لە رێگەی دەزگاکانی راگەیاندنەوە، وەك رۆژنامەو رادیۆو سینەماو کۆڕو ئاهەنگو پێشانگاو شتی واوە، ئەمەش لە پێناو لێکگەیشتنو قەناعەت پێهێنانو بەدەستخستنی پشتگیری".

ئەم پێناسەیەش، پێناسەیەکی گشتگیر نییە و تەنێ چەند لایەنێکی کاری راگەیاندن دەگرێتەوە.

٥ـ بە پێی پێناسەی هەندێکی تر، راگەیاندن بریتییە لە: "هێنانی چەند راوبۆچوونو بابەتێکی رۆشنبیریو چەند راستییەکی بابەتییە کە هەندێ کاریگەرییان هەیە لەسەر بیروباوەڕو رەفتارو هەڵسوکەوتی ئەوانەی شتەکانیان بۆ دەگوازرێتەوە".

---

[1] سورەتی (هود: ١٢).

٦ـ هەرچی (هادی نعمان الهیتی)یە ئاوا راگەیاندنی پێناسە کردووە کە بریتییە لە: "پرۆسەی سوودگەیاندن بە خەڵك بە هەواڵو راستیو زانیارییە راستەکان لە رێگەی چەند دەزگاو هۆیەکی تایبەتەوە، یان بریتییە لە ئاشنا کردنی رای گشتی لە ناوەوەو دەرەوە لەوەی روو دەدات لە رووداوو پێشهاتەکان، وە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری و رۆشنبیری لە ریزەکانی جەماوەردا".

٧ـ بەپێی پێناسەی رایت (Wright)یش، راگەیاندن بریتییە "لەو پرۆسەیەی کە بەهۆیەوە مانایەك لە ماناکان لەنێو تاکەکاندا دەگوزارێتەوە".

٨ـ پێناسەیەکی تر ئەوەیە کە راگەیاندن بریتییە لە: "بەکارهێنانی نەخشەدارو بەپلان بۆ شێوازی پڕوپاگەندەو شێوازەکانی تر بە ئامانجی کاریگەری دروست کردن لەسەر سۆزو بیروڕاو رەفتارو ئاراستەی لایەنی بەرامبەر چ دۆست بێ یان نەیارو دوژمن، یاخود بێلایەن، ئەمەش لە پێناو خزمەتکردنی ئامانجەکانی بانگەوازو بەهێزکردنی دەسکەوتە نیشتمانیو نەتەوەییو بیروباوەڕییەکاندا".[1]

یان راگەیاندن بریتیە لە پەخشو بڵاوکردنەوەی هەواڵو بیروڕاو راستیو زانیارییە دروستو راستەکان لە هۆو کەناڵە جیاجیاکانی راگەیاندا.

٩ـ راگەیاندنی نوێ ئاواش پێناسە دەکرێت کە "پرۆسەیەکی پەروەردەییە کە بەشێکی بریتییە لە هونەری قەناعەت پێهێنانو دروست کردنی رەفتارو مەیلو ئاراستەگەل لای گەورەو تەمەندارەکان، لەلایەکەوەو چاندنی رەوشتو بەهاکان لای نەوەی تازەپێگەیشتوو لەو تەمەنانەی لە خوار (٩) ساڵییەوەنو راهێنانو بەهێزکردنیان دژ بە راگەیاندنی نەیارو دوژمنکارانە لە داهاتوودا، لەلایەکی ترەوە".[2]

لەم پێناسانەی پێشووەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زاناو بیرمەندان تائێستا لەسەر پێناسەیەکی وردو دیاریکراو بۆ چەمکی راگەیاندن رێکنەکەوتوون، دەوڵەتو حکومەتەکانی دنیاش جیاوازن لە تێگەیشتنو راڤەکردنی راگەیاندن هەریەکەیان بەپێی سیستمی حوکمڕانی و جیهانبینی خۆیو فەلسەفەی کۆمەڵگاکەی و دیدوتێڕوانینی بۆ گشت بوارەکانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو کلتوری کۆمەڵگا.

---

[1] موسى زيد الكيلاني - الاعلام السياسي والاسلام، مؤسسة الرسالة، الطبعة الاولى، بيروت، ١٤٠٥هـ - ١٩٨٥م، ص٢٧.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧ـ ٢٨.

گەرچی پێناسەیەکی دیاریکراوی وانییە هەموو لایەك لەسەری کۆك بن و چەمکی زاراوەی (راگەیاندن) بەوردی شی بکاتەوە، وەلێ زاناکان تارادەیەکی زۆر هاوڕان و دەتوانین بێژین (نیمچە هاوڕان) لەسەر بنەماو پرەنسیپە گشتییەکانی راگەیاندن کە ئەمانەن[1]:

١ـ ئەو بابەتو راستییانەی ژمارەو داتاو سەرژمێرییەکان پشتگیرییان دەکەن.

٢ـ بابەتی بوونو دوورکەوتنەوە لە خودگەرایی لە بڵاوکردنەوەی راستیەکاندا.

٣ـ راستگۆییو پاراستنی ئەمانەت لە کۆکردنەوەو گواستنەوەی لێدوانەکان و روونکردنەوەکان لە سەرچاوە ئەسڵیەکانی خۆیانەوە.

٤ـ گوزارشت کردنێکی راستگۆیانە لەو جەماوەرو خەڵکەی راگەیاندنەکەیان ئاراستە دەکرێت.

چەمکی پێچەوانەی ئەم خاڵانەی پێشوو ئەوە دەگەیەنێ کە:

١ـ ئەو راگەیاندنەی لەسەر بنەمای واقیع ناوەستێت، بەڵکو لەسەر خەیاڵو گریمانە، چەمکی راگەیاندن نایگرێتەوە.

٢ـ ئەو رۆژنامەوانو راگەیاندنکارەی بەپێی ئارەزوو و مەیلی خۆی راوبۆچوونی تێکەڵ بەو زانیارییو بابەتانە دەکات کە بۆ جەماوەری دەگوازێتەوە و بەو جۆرە دایان دەڕێژێتەوە کە خۆی دەیەوێ، خەسڵەتی راگەیاندنکارو رۆژنامەوان لەدەست دەدات.

٣ـ ئەگەر راستگۆیی و ئەمانەت نەکران بە پێوەری گەیشتن بە زانیارییو لێدوانو هەواڵەکانو گەیاندنیان بە خەڵکی، ئەوا راگەیاندن گرنگترین کۆڵەگەکانی خۆی کە راستگۆیی (**المصداقية**)یە لەدەست دەدات.

٤ـ کاتێك راگەیاندن بەشێوەیەکی راستگۆیانەو دەستپاکانە گوزارشتی لەبیروباوەڕو کلتورو دابو نەریتە رەسەنەکانی جەماوەر نەکردو لەگەڵ رۆحی نەتەوەو تێگەیشتن و بیرکردنەوەیاندا نەدەگونجا، ئەوا جەماوەر پێشوازی لێ ناکەنو نامۆ دەبێت پێیانو سەرەنجام سەرکەوتوو نابێت.

---

[1] بڕوانە: تیسیر محجوب الفتیانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧ـ ٢٨.

## مێژووی راگەیاندن

راگەیاندن مێژوویەکی کۆنی هەیە و دەتوانین بڵێین لەگەڵ دروستبوونی مرۆڤو نیشتەجێبوونی لەسەر زەویدا بوونی هەبووە، چونکە گەر راگەیاندن شێوەیەك لەشێوەکانی پەیوەندیکردن (**الإتصال**) بێت کە ناوە زانستییەکەیەتی، بەم واتایە هەر لە سەرەتای دروستبوونی ئادەمیزادەوە پرۆسەی راگەیاندن دەستی پێ کردووەو مرۆڤ خۆی مومارەسەی کردووە لە میانەی قسەو دیالۆگو وتوێژەوە کە بەکاری هێناوە بۆ قەناعەت پێهێنانی بەرامبەرو تێگەیاندنی، بەڵام کە دەڵێین راگەیاندن کۆنە وەکو بوونێکی کۆمەڵایەتی، مانای بوونی دەزگای رێکخراوی راگەیاندن وەك ئەوەی ئێستا هەیە ناگەیەنێت، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە خوای گەورە مرۆڤی وادروست کردووە کە بە سروشت بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بێتو حەز بە تێکەڵاو بوونو پێکەوە ژیان لەگەڵ خەڵکانی تردا بکات و قسەو وتوویژ لەگەڵیاندا ئاڵوگۆڕ بکات، بەڵگەش لەسەر راستی ئەم وتەیە، واتە زانینی زمانی وتوویژو شێوازی گواستنەوەی وشەو پەیامو مەبەستی خۆی و گەیاندنی بە مرۆڤی تر دوای ناسینی شتەکانو ناوەکانیان، قورئانی پیرۆزە، کە دەفەرموێت: (**وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا**)[1]. واتە: خودا هەموو ناوێکی فێری ئادەم کرد.

پاشان لەگەڵ گەشەکردنو بەرەوپێشچوونی مرۆڤایەتیو گەشەکردنی کایە مرۆڤایەتییەکانو پەرەسەندنی پەیوەندییە مرۆییو نێودەوڵەتییەکان، راگەیاندنیش وردە وردە گەشەی کردووەو بەچەندین قۆناغی جۆراو جۆردا گوزەری کردووە.

فیرعەونەکان بەردیان هەڵکۆڵیوەو فەرمانەکانیان لەسەر نووسیوەتەوە، هەروەها لەسەر پەرستگاکان، هەتا وای لێهاتووە هەواڵی سەربازیو وەرزشیشیان بڵاوکردۆتەوە، دکتۆر (**عبدالقادر حاتم**) لە کتێبەکەیدا (**الرأي وتأثره بالإعلام والدعاية**) شوێنەوارە گەورەکانی فیرعەونەکان (وەك ئەهرامەکان) لە هونەرەکانی راگەیاندن دەیانژمێرێتو دەڵێ: فیرعەونەکان سیو حەوت سەدە لەمەوپێش رۆژنامەگەری (**الصحافة**)یان ناسیوە.[2]

لای یۆنانییەکانیش راگەیاندن خۆی لە وتاربێژە سیاسییەکانو ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەدا ئەبینیەوە کە تیایاندا قارەمانێتی و شەڕەکانیان بە شیعر و هۆنراوەی حەماسییەوە

---

[1] (البقرة: ٣١).

[2] **تیسیر محجوب الفتیانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤.**

ئەگێڕایەوە، ئەفلاتون وەك هونەرێكی قەناعەت پێهێنان دەیڕوانییە وتاربێژیو بەپێویستی دەزانی كە پیاوی دەوڵەت لە میانەی سیاسەتدا فێری وتاربێژی ببێت.

راگەیاندن لای رۆمانییەكان خۆی لە پەیامی مژدەدەرە دیانەكاندا دەبینییەوە، كە ئەوان بۆ مژدەدان بە ئینجیل بە وڵاتاندا یان بە ناوچەكاندا بڵاودەبوونەوە، ئەمەش بە هەنگاوگەلی پڕ بایەخ لە مێژووی پەرەسەندنی راگەیاندن دێتە هەژمار.

لە رۆژگاری (یۆلیۆس)ی قەیسەردا رۆژنامەی (رووداوەكانی رۆژ ـ **الحوادث اليومية**) دەرچووە كە هەواڵی جۆراوجۆری لە خۆگرتووە، لەوانەش دەنگو باسی سیاسی بەشێوەیەكی تایبەتی.

دەگێڕنەوە كە (قەیسەر) هەوڵێداوە رووی هاوڵاتیانی لە گرفتو كەموكوڕییەكانی حكومەت وەرگێڕێو بە هەواڵی تایبەت بە وەرزشی جەستەیی سەرقاڵیان بكات، كە جەماوەری ئیغریقی لە گۆڕەپانێكی گشتییدا كۆدەبوونەوەو سەیری ئەو بەرەندە (فائز)ەیان دەكرد كە لەناویاندا دەردەكەوت پاش ماندووبوونێكی زۆرو بڕینی مەودای (٣٦) كیلۆمەتر كە بە هەناسەبڕكێوە ئەنجامەكەی رادەگەیاند.

پاشان لەناو گەلانی تریشدا راگەیاندن پەرەی سەندو بەشێوازی جیاجیا بڵاوبوویەوە، لە عێراقیشدا، زانایانی شوێنەوارناس چەند بڵاوكراوەیەكیان دۆزییەوە كە مێژووەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٠٠پ. ز) كە جوتیارەكانیان رێنمایی كردووە چۆن تۆوەكانیان بچێنن و ئاوی بدەنو لە نەخۆشییەكان بیانپارێزن، كە ئەم پەخشنامانە تارادەیەك لەو بڵاوكراوەو ئاگادارینامانە دەچن كە وەزارەتەكانی كشتوكاڵ ئاراستەی جوتیاران و خاوەن كێڵگەكانی دەكەن لە وڵاتە پێشكەوتووەكاندا.[١]

مێژوونووسانو پسپۆڕانی بواری مێژووی رۆژنامەنووسی سەرەتاكانی سەرهەڵدانی كاری رۆژنامەگەری دەگەڕێننەوە بۆ ساڵی (٩١١)ی پێش زاین لە كیشوەری ئاسیا، كاتێ حكومەتی دەسەڵاتداری ئەو كاتەی چین لە پێناو دەستەبەركردنی هەموو شێوازێكی كاریگەر بۆ پایەداركردنی پێگەی دەسەڵاتەكەیان، رۆژنامەی (كین بان)یان بڵاوكردەوە، كە

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦ـ ٣٨.

ڕۆژانە سێ جارو بەسێ رووخسارو سێ ژەمە بڵاودەکرایەوە، بەیانیان بە ڕەنگی زەرد، نیوەڕۆیان بە ڕەنگی سپی، ئێوارانیش بە ڕەنگی سوور، دەردەچوو.[1]

لە دوورگەی عەرەبیشدا بوارو شێوازی پێوەندیکردن دوو جۆری هەبووە:

جۆری یەکەم: لە نێوان عەرەبەکان خۆیاندا، کە خۆی لەم بوارانەدا ئەبینییەوە:

١ـ هەڵبەستی شیعری.

٢ـ وتارو وتاربێژان.

٣ـ بانگکردن.

٤ـ جێژنەکان.

٥ـ بازاڕەکان.

٦ـ کۆڕو کۆبوونەوە (**الندوة**).

٧ـ ئاگرکردنەوە لەسەر لوتکەی چیاکان.

٨ـ کتێبە ئایینییەکان.

٩ـ بەڵێنو پەیمانو هاوپەیمانێتی.

١٠ـ نامە تایبەتییەکان.

١١ـ ماڵەکانی خواپەرستی.

١٢ـ چیرۆکو بەسەرهات.

١٣ـ پەندو قسەی نەستەقو شێوازەکانی تر.

جۆری دووەم: لە نێوان عەرەبەکانو غەیری خۆیاندا، ئەمیش خۆی لە چەند بوارێکدا دەبینییەوە:

١ـ بازرگانی.

٢ـ ئەو شارو ئیمارەتانەی هاوسنووری دوو دەوڵەتی فارسو ڕۆم بوون.

٣ـ نێردە (**البعثات**)کانی جوولەکەو دیانەکان.

٤ـ شەڕو پەلامارو داگیرکردنەکان.

---

[1] برایمی مەلا ـ ڕۆژنامەگەری لەسەرەتای سەرهەڵدانەکانەوە تا چەرخی نوێکاری، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل١٠.

ئەم شێوازانەی پێشوو بۆ پەیوەندیکردنو راگەیاندنو یەکترناسینو ئاگادارکردنەوە سوودیان لێوەرگیراوە.[1]

مسوڵمانانیش لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە سوودیان لە چەند شێوازێکی راگەیاندن وەردەگرت، کە بە کورتی دەتوانین ئاماژە بە گرنگترینیان بکەین:[2]

١ـ شیعرو هۆنراوە.

٢ـ وتاربێژیی.

٣ـ قورئانی پیرۆز.

٤ـ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ).

٥ـ سەرمەشقی جوان (**القدوة الحسنة**).

٦ـ پەیوەندی تاکی و دەستەجەمعی.

٧ـ مزگەوت.

٨ـ کۆچکردنەکان.

٩ـ پەیماندانەکان (البیعات).

پاشان لەگەڵ رۆیشتنی رۆژگارو بەرفراوانبوونی سنووری دەوڵەتو قەڵەمڕەوی ئیسلامییدا، شێوازەکانی راگەیاندنو بانگەوازیش پەرەیان سەند، بەتایبەت لەسەردەمی عەبباسیو فاتمییەکاندا، و ئینجا سەردەمی ئەییوبییەکانو عوسمانییەکان، و فەمانڕەوایانی ئیسلام گرنگی زۆریان بە بواری راگەیاندن داوەو داناو زانا مسوڵمانەکان بەکردەیی مومارەسەی کاری ئیعلامییان کردووە هەروەك دواتر ئاماژەی پێدەکەین.

مێژووی راگەیاندنیش لە ئەوروپا دا بەتایبەت مێژووی رۆژنامەگەریی تا ئەمڕۆ بەتەواوی روون نەبووەتەوە، بەڵام زۆربەی مێژوونووسەکان دەیگەڕێننەوە بۆ سەدەی (١٣ز)و بەدیاریکراوی بۆ ساڵی (١٢٧٥ز)، ئەوکاتەی کە کۆشکی پادشایی بەریتانیا بڕیارێکی لەوساڵەدا دەرکرد دژ بە بڵاوکردنەوەی هەواڵنامە پڕوپاگەندە ئامێزەکان، کە وەك بەڵگەیەك بۆ بوونی رۆژنامە یان بڵاوکراوەیەکی لەو چەشنەی دادەنێن لەو سەردەمەدا.[3]

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ ئەم شێوازو بوارانە، بڕوانە: تیسیر محجوب الفتیانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩ـ ٦٠.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل٦١ـ ٧٠.

[3] برایمی مەلا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠.

پاشان لەگەڵ داهێنانی ئامێری چاپ لەلایەن زانای ئەڵمانی (گۆتەنبەرگ)دا لە ساڵی (١٤٣٦ز)، راگەیاندن هەنگاوێکی مەزنی بەرەو پێشەوەنا، لەسەدەی حەڤدەهەم بیرۆکەی کۆکردنەوەی هەواڵەکان لە دایك بوو، و خاوەن چاپخانەکان هەڵدەستان بە چاپکردنی بلاوکراوە هەواڵییەکان (النشرات الاخباریە)، یەکەم رۆژنامەی چاپکراویش لە لایەن (أبراهام فیرهوتن) لە بەلجیکا بلاوکرایەوە لە شاری (أنفرس)، لە ساڵی (١٦٠٦ز) لە شاری ستراسبۆرگی فەرەنسا یەك لە رۆژنامە یەکەمینەکان و پاشان رۆژنامەی ئەگازێت ساڵی (١٦٣١ز) بلاوکرانەوە.[١]

لە سەدەی هەژدەهەمدا راگەیاندن شێوازێکی هاوچەرخانەی بەخۆوەدیتو بەهاتنی سەدەی نۆزدەهەم راگەیاندن بەهۆی پەرەسەندنی تەکنیکییەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینی، ئەوەبوو کە ئاژانسە هەواڵییە بەناوبانگەکان پەیدابوون، ئاژانسی (هافاس Havas)ی فەرنسی ساڵی (١٨٣٥ز) و ئاژانسی (ئەسوشێتدپرێس Associated Press)ی ئەمریکی ساڵی (١٨٤٨ز)و ئاژانسی (رۆیتەر Reuters)ی بەرتیانی لە ساڵی ١٨٥١ز، پەیدابوون.

ئیتر لەو کاتەوە هونەری رۆژنامەوانی پەرەی سەندو وێڕای رۆژنامەو ئاژانسە هەواڵییەکان، وێنەکێشانو وێنەی فۆتۆگرافی پەیدابوون.

پاشان چەندین دەزگای راگەیاندنی تر سەریان هەڵدا وەك سینەماو رادیۆو تەلەفزیۆن، کە یەکەم شوێن یان هۆڵ بۆ سینەما لە ساڵی (١٨٩٥ز) لە پاریس کرایەوە، لە نێوان ساڵانی (١٩٢٠ـ ١٩٢١ز) یەکەمین ئێزگەی رادیۆیی لە هەریەکە لە پاریسو ئینگلتەرا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بیسترا، ئینجا لە ولاتی فەرەنسا.

یەکەم کاسێتی تەلەفزیۆنیش ساڵی (١٩٤٩ز) بۆ هەواڵ پەخشکرا.[٢] بەلام لە ولاتانی عەرەبیدا یەکەم رۆژنامە لە ساڵی (١٨٢٨ز) بەناوی (**وقائع المصرية**) لەلایەن (**محمد علي**) فەرمانڕەوای میصر دەرچووە.[١]

---

[1] تیسیر محجوب الفتیانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٩ـ٨٠. برایمی مەلا، سەرچاوەی پێشوو، ل١١.

[2] بڕوانە: تیسیر محجوب الفتیانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠ـ ٨١. دکتۆر فاروق موحەممەد ئەبوزەید، سەرەتایەك لە زانستی رۆژنامەوانی، وەرگێرانی فەرەیدون رەئوف عارف، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٢٨١ـ ٢٨٣.

پاشان لەگەڵ گەشەکردنو بەرەوپێشچوونی مرۆڤایەتیو گەشەکردنی کایە مرۆڤایەتییەکانو پەرەسەندنی پەیوەندییە مرۆییو نێودەوڵەتییەکان راگەیاندنیش بەچەندین قۆناغی جۆراوجۆر دا گوزەری کردووە تا گەیشتووەتە ئەم قۆناغەی ئێستای کە راگەیاندن تەنیا لە چوارچێوەی (بیستنو نووسیندا) نەماوەتەوەو چەندین پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە بینیوە کە ئەو هەموو دەزگای بینینو بیستنو تەکنیکی نوێیە هاتۆتە ئارا لە رادیۆو تەلەفزیۆنو کەناڵی ئاسمانیو رۆژنامەگەریی بە هەموو جۆرەکانییەوە تا ئەو ئاستەی خۆی لە مەیدانەکەدا سەپاندووەو بە دەسەڵاتی چوارەم ناوزەد دەکرێ، لەتەك هەموو ئەوانەشدا، تەکنەلۆژیای ئینتەرنێتیشی بۆ زیاد بووە.[2]

## پێکهاتەکانی راگەیاندن

لە زمانی کوردیدا (راگەیاندن) بە مانای (پێڕاگەیاندن) دێتو لە بنەڕەتەوە لە دوو پێشگری (پێ + ڕا) لەگەڵ چاوگی (گەیاندن) پێکهاتووەو لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانی (راگەیاندن)و رۆشتنی ئەم فۆڕمەی لە (پێڕاگەیاندن) کەوتۆتەوە لای نێرەرو وەرگری کورد، ئێستا فۆڕمەکە بە (راگەیاندن) ماوەتەوە).[3]

بەڵام راگەیاندن وەك هەرتێڕێکی مرۆیی تر دەکرێ پێناسەکەی لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر بەپێی فەلسەفەو پێکهاتەو ئاستە کۆمەڵایەتیەکانی، جیاواز بێت، هەروەك جیاوازی کات کاریگەریی خۆی هەیە، لەتەك مەسەلەگەلی ئابووریو بازرگانیو بەرژەوەندی تر، بە کورتی ئەو فاکتەرانەی وادەکەن راگەیاندن بەپێی کاتو شوێن جیاوازبێت بریتین لە:

١- جۆری سیستمی فەرمانڕەوایی.
٢- جۆری سیستمو پێکهاتەی کۆمەڵایەتی.

---

[1] دکتۆر فاروق موحەممەد ئەبوزەید، سەرچاوەی پێشوو. ل٤٣.

[2] بۆ زیاتر شارەزایی لە مێژووی راگەیاندن، بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣و دواتری. دکتۆر فاروق موحەممەد ئەبوزەید، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٩. تیسیر محجوب الفتیانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١ و دواتری. برایمی مەلا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠و دواتری.

[3] هەڤاڵ ئەبوبەکر ـ سەرچاوەی پێشوو، ل١٥ ـ ١٦.

٣ـ جۆری سیستمی ئابووریو بازرگانی.

کەوابوو سیستمی راگەیاندن لەهەر کۆمەڵگایەکدا شتێك نییە جگە لە رەنگدانەوەی سیستمی سیاسیو کۆمەڵایەتیو کلتوریی ژیاری باو لەو کۆمەڵگایەو ئاستی پەرەسەندنو پێشکەوتنی ژیاریی تیایدا، فرەسیستمی سیاسیش بۆتە لەمپەری دروستبوونی ئۆڵگۆیەکی راگەیاندنی یەکگرتوو لە جیهاندا، بۆیە دەبینین لە سەدەی بیستەمدا، دوو سیستمی راگەیاندن لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا خۆیان سەپاند کە ئەوانیش:

١ـ سیستمی راگەیاندنی خۆرئاوا وەك رەنگدانەوەی نیزامی لیبڕالی.

٢ـ سیستمی راگەیاندنی خۆرهەڵات وەك رەنگدانەوەی نیزامنی سۆشیالیستی.

وەلێ هەردوو سیستمەکە بەرهەمی یەك ژیار بوون کە ئەویش ژیاری تازەی خۆرئاوایە بە ئایدیۆلۆژیا جیاوازەکەیەوە.[1]

تیۆروانینی فیکری سیستمی ڕاگەیاندنی خۆرئاوا ـ کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نوێنەرایەتی دەکات ـ لە سەر بنەمای فەلسەفەی لیبڕالی ڕاوەستاوە بە هەردوو باڵەکەی : ئابووری کە خۆی لە سەرمایەداریدا ئەبینێتەوە و سیاسی کە خۆی لە دیموکراسیدا ئەبینێتەو ە.

بە پێی سیستمی ناوبراو تاك ئازادە لە بەدەستخستنی زانیاریو مەعریفە، لەگەڵ رەچاوکردنی خاوەندارێتی تاکیو فرەدامو دەزگایی پێوەندیکردنو رەتکردنەوەی هەرکۆتو مەرجێك لە دەرەوەی ئەو دەزگایانەوە بێت، بەڵام بە ئەزموونو مومارەسەی کرداری ئەو راستییە سەلماوە کە ئازادی راگەیاندن، ئازادییەکی بێلایەن نەبووە، بەڵکو لایەنگیری بەرژەوەندی خاوەن کۆمپانیاو دەزگا ئیعلامییەکان بووەو مۆرکێکی مۆنۆپۆڵکردن (إحتكار)ی پێوە بووە، چونکە زۆربەی هەرە زۆری هۆکانی راگەیاندنی خۆرئاوا پشت بە (ریکلام) دەبەستن بۆ دەستخستنی قازانجی زێترو سەرمایەی پتر، بۆیە گەرچی هەوڵی زۆر دراوە بۆ دروستکردنی جۆرێك لە هاوسەنگی لە نێوان لیبراڵیەتی راگەیاندن کە ئازادی و بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی بەیەکەوە گرێ بدات، بەڵام هەروا مۆرکی مۆنۆپۆڵکردن و دەست

---

[1] دکتؤرة حنان يوسف ـ الإعلام و السياسة مقاربة ارتباطية، أطلس للنشر والانتاج الاعلامي، ط٢، القاهرة، ٢٠٠٦، ص٣٩.

بەسەراگرتنی دەزگا راگەیاندنەکان باڵی کێشاوە بەسەر راگەیاندنی خۆرئاوا بە گشتیو سیستمەکانی تری پێوەندیکردنیشدا.

سیستمی راگەیاندنی خۆرهەڵاتیش کە فەلسەفەی مارکسی ـ لینینی چوارچێوە فیکرییەکەی پێکدەهێنا ـ و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو نوێنەرایەتی دەکرد ـ لەسەر بنەمای رەتکردنەوەو رەخنەکردنی لیبڕاڵیەتو تاوانبارکردنی بە قۆستنەوەی بۆرژوازییەت دژ بە چینی کرێکارو ستەملێکردنو چەوساندنەوەی، پایەی داکوتابوو.

لە کاتێکدا بونیادی ساسی سۆسیالیستی لەسەر دیکتاتۆریەتی پڕۆلیتاریا کە خۆی لە حیزبی کۆمۆنیست (شیوعی)دا ئەبینیەوە، وەستابوو.

بەپێی ئەم چەمكو تێڕوانینە هۆکانی پێوەندیکردنو دەزگاکانی راگەیاندن، وەك چەكو هۆکارێکی ئایدۆلۆژی بۆ بەرجەستەکردنی ئامانجە سۆسیالیستییەکان بەکاردەبرێن لە پێشیانەوەش خاوەندارێتی گشتیو کۆمەڵایەتی دەزگاو هۆکانی راگەیاندنو پێوەندیکردن وەك گرەنتییەك بۆ نەقۆستنەوەو ئیحتیکار نەکردنی ئەو دەزگایانە لە لایەن دامەزراوە مۆنۆپۆڵییە سەرمایەدارەکانو چینی بۆرژوازی.[1]

بەڵام ئەم سیستمەش نەیتوانی ناسنامە دیکتاتۆریو پاوانخوازییەکەی بشارێتەوە، ئەوەبوو کە راگەیاندنی یەکێتی سۆڤییەت کەوتە ژێر دەسەڵاتی حیزبی کۆمۆنیستو سانسۆڕی توندی خرایە سەرو ئازادییەکان بەرتەسك بوونەوە تا وای لێهات جۆرێك لە شۆڕش لەنێو خۆی کۆمەڵگا سۆسیالیستییەکان سەری هەڵدا، کە لە بزووتنەوەکەی گۆڕباچۆفو پڕۆسترۆیکاکەیدا گەیشتە چڵەپۆپەو هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەتو سیستمە راگەیاندنییە خۆرهەڵاتییەکەی بەدوادا هات و دواجار نیزامی دوو جەمسەریش کۆتایی پێهات، بەڵام لەبەرژەوەندی جەمسەرەکەی تردا کە ئەمریکا بوو، کە ئێستا رێبەرایەتی سیستمی راگەیاندنی نوێی جیهانی دەکاتو دارای هۆکانی سەپاندنی دەسەڵاتی سیاسیو سەربازیو ئابوورییە بەسەر زۆرێك لە ناوچەکانی جیهانداو هەنووکە توانستە ئیعلامییەکانی گەشەی زۆری کردووە دوای وەرچەرخانی سیستمی نێو نەتەوەیی لە دوو جەمسەرییەوە بۆ تاك جەمسەری، بۆیە پلەی یەکەمی هەیە لە دابەشکردنی پڕۆگرامە تەلەفزیۆنییەکان دوای ئەویش ئینگلتەرا دێت پاشان فەرەنساو ئەڵمانیاو یابان.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣.

ئەم باڵادەستییەی راگەیاندنی خۆرئاواو هەژموونی عەولەمەی راگەیاندنە، بەتایبەت گەر بە وردی سەرنج بدەین لە هۆکانی راگەیاندن وەك تەلەفزیۆن‌و رادیۆو سینەماو ئینتەرنێت، ئامادەیی ئەمریکاو خۆرئاوا تیایدا نەشاراوەیە، ئەمە وای کرد چەندان دەنگ بەرز بکرێنەوە لە ئەوروپاو زۆر وڵاتی تر دژ بەو هەژموونە راگەیاندنییە نوێیە تاك جەمسەرییە، بەباوەڕی ئەوە کە دژ بە فەرهەنگ‌و کلتوری تایبەتی گەلان، نەخاسمە لەگەڵ باڵادەست بوونی کلتوری ئەمریکی دا دەوەستێت، کە پشت بە توخمی قازانج و بەکاربردرن (**الإستِهلاك**) دەبەستێت‌و گەلانی دنیا دەکاتە وابەستەو بەکاربەر (**مُستهلِك**) کە لە کۆتاییدا رای گشتییەك کە خزمەت بە ئامانجەکانی تاك جەمسەری بکات دروست دەبێ، نەك رای گشتییەکی جیهانی سەربەخۆو بەرچاو رۆشن کە رووداوو مەسەلە گەلی جیهانی وەکو خۆی تێبگات‌و هاوکاربێت لەچارەسەرکردنیان.

بە ئاقاری ئەو لایەنە نێگەتیڤانەی عەولەمەو عەولەمەی راگەیاندن بە تایبەتی، هەندێ وای بۆ دەچن کە راگەیاندنی جیهانی (**كَوْني**) دەشێ ببێتە پردی بەیەکگەیشتن و دیالۆگێکی راستەوخۆو بەردەوام لە نێوان گەلانی جۆراو جۆری دنیاو لەیەك نزیك خستنەوەی ژیارو کلتورە لە یەك جیاوازەکان‌و ئاڵوگۆڕی بیروڕاو زانیارییەکان‌و سەرەنجام لەیەکگەیشتنی هاوبەش، بەڵام ئەم گۆشەنیگایە تاهەنووکە جێگای مشت‌و مڕەو نەسەلماوە.[1] چونکە وابەستەیی ئیعلامی لە زۆر بەی وڵاتانی جیهانی سێ‌و وڵاتە عەرەبییەکاندا بە ئاشکرا هەستی پێدەکرێ‌و مەترسیدارترینی ئەو تەبەعیەتەش لە ناوەڕۆکی بابەتە ئیعلامییەکاندا هەستی پێدەکەی کە لەو کەناڵە جۆربەجۆرانە بڵاودەبنەوە، کە لە زۆربەی کاتا هاوسەنگی و پێوەندی ناوەڕۆکی بابەتەکان لەگەڵ سروشتی کێشە ئەسڵییەکانی ئەو وڵاتانەو بارە کۆمەڵایەتی‌و کلتورییەکانیاندا، ئامادەنییە. بەهەرحاڵ پێویستە لێرەدا ئەم توخمانەی خوارەوە بزانین‌و بوونیان هەبێت.[2]

**١- نێرەر (Sender): سەرچاوەی ناردنی زانیارییەکان.**

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣.

[2] بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧- ١٩. رەئوف حەسەن، ئەلفاوبێتای رۆژنامەگەریی، چاپخانەو ئۆفسێتی روون، سلێمانی ١٩٩٩، ل٣٥- ٤٦.

**٢- بابەت .. پەیام (Message)**: ناوەڕۆکی ئەو زانیارییانەی دەنێردرێن، لە هەواڵو ریپۆرتاژو راپۆرتەهەواڵو پەیامو بابەتە ئایینیو رۆشنبیریو هونەریو بازرگانیو وەرزشیو کۆمەڵایەتیو تەرفیهی... تاد. پێویستە لێرەدا ئەمانە لەبەرچاو بگیرێت:

پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، قەبارەی خەڵك، ئایین، مێژوو، جوگرافیا، ئاستی هۆشیاریو تێگەیشتنی خەڵكو ژیانیان، دابو نەریتە باوەکان، تەمەنو رەگەزو سایکۆلۆژیەتی جەماوەر، شێوازی داڕشتنو دەربڕینی پەیامو بابەتەکان بەشێوەیەك خەڵکانی ئاسایی بە ئاسانی تێیان بگەن، چونکە بە گشتی بۆ ئەوان ئاراستە دەکرێن.

**٣- هۆو ئامرازی گەیاندن (Medi)**: سەرجەم ئەو کەناڵو هۆو ئامرازانە دەگرێتەوە کە بە هۆیەوە زانیارییەکان دەنێردرێن بۆ لای (وەرگر)، لە کەناڵو کەرەسەو دەزگای (خوێنراوو بینراوو بیستراو) کە رادیۆو تەلەفزیۆنو رۆژنامەو کتێبو ئینتەرنێت.. دەگرێتەوە.

**٤- وەرگر یان پێشوازیکەر (Receiver)**: ئەو کەسەی زانیارییە نێردراوەکان وەردەگرێت.

**٥- شوێن (Venue)**: ئەو جێگایەی پەیامەکانی ئاڕاستە دەکرێت، ئاخۆ چەند دەڤەرو ناوچەیە، هەڵکەوتی جوگرافیو خوو رەوشتو دابو نەریتی خەڵکانی ئەو ناوچەیەو دوور و نزیکیان لە یەکتری چەنێکە.

**٦- کات (Time)**: کاتی ناردنی پەیامەکانو تواناو ئامادەیی کەسی وەرگر بۆ وەرگرتنیان لەو کاتەدا.

**٧- زمانی هاوبەش (Common Language)**: واتە وشەو رستەی زمانی هاوبەش لە نێوان هەردوو (نێرەر)و (وەرگر)دا هەبێتو وەرگرەکە لە ناوەڕۆکی ئەو بابەتو پەیامانە بگات کە ئاڕاستەی دەکرێن.

**٨- کاریگەریی (Effect)**: کاریگەریی و کارتێکردنی ئەو پەیامانە لەسەر وەرگر چەندو بەچ شێوەیەك دەبن کە بۆی دەنێردرێن.

## بایەخ و گرنگی راگەیاندن

راگەیاندن فاکتەرێکی هەرەگرنگ، یاخود گرنگترین فاکتەری هۆشیارکردنەوەو تێگەیاندنو پێگەیاندنی جەماوەرو کۆمەڵگایەو رۆڵێکی گەورە دەبینێت لە بنیاتنانی سیستمی کۆمەڵایەتیداو لە گشت بوارە جیاجیاکانی ئایینی، ئابووری، سیاسی، فێرکردن، رۆشنبیری، پەروەردە..).

راگەیاندن وەکو چەکێکی دوو سەرە، ئەتوانرێت بەشێوازێکی رێكو پێكو ئیجابیانەو دوور لە چەواشەکاری ئاراستە بکرێت بۆ راستکردنەوەی هەڵەو کەموکورِیو چەمکە ئاوەژووەکان، و ئاراستەکردنی کۆمەڵگا بەرەو یەکرِیزیو برایەتیو یەکخستنی تواناکانو دروستکردنی گیانی پێکەوە ژیانو هاریکاریو دەستگیرۆیی یەکترو بەرەو پێشڤەبردنی کۆمەڵگا، بە گشتی لە خزمەت خۆشبەختیو هۆشیاری تاكو کۆمەڵ دابێت.

دیارە دەشتوانرێت بەشێوازێکی خراپو ئاراستەیەکی سلبی بەکاربهێنرێت وەك فاکتەرێکی تێکدانو پەرت کردنی ریزەکانی گەلو هێزو لایەنەکانو نانەوەی ئاژاوەو تێکدانی نێوان چینو توێژو پێکهاتەکانی کۆمەڵو بلاوکردنەوەی گەرای خراپەکاریو گەندەڵیو رقو کینەو دوژمنکاریو خستنەگەڕی وەك چەکێکی گوشندە دژ بە بەها بالاکانی کۆمەڵگاو داروخاندنی.

راگەیاندن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی کۆنەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروست بوونی مرۆڤو نیشتەجێ بوونی لە سەر زەوی دا، وەك لە پێشەوە باسمان کرد، چونکە خودا مرۆڤی وەك کائینێکی کۆمەڵایەتی وا دروست کرد کە حەز بە تێکەڵاو بوونو پەیوەندی کردن لەگەڵ خەڵکانی ترداو دواندنیانو پێکەوە ئاشنابوونو ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی بکات، قورئانی پیرۆز ئاماژە بەو راستییە دەکات کە خوا مرۆڤەکانی بەنێرو مێیەوە بۆ ئەوە دروست کردووەو کردوونی بە چەندین گەلو تیرەو هۆزی جیاجیا، تا پێکەوە ئاشنابنو یەکتری بناسن، **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)**.[1]

---

[1] (الحجرات: ١٣).

وه زمانی جیاجیای پێداون تاوەکو پێکەوە بئاخفنو گوزارشت لە راوبۆچوونو ناخی خۆیان بکەنو هەواڵو روداوو شتی بە سوود بۆ یەکتر بگوازنەوە (**وَمِنْ آيَاتِه خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ**)[1] واتە: هەر لە نیشانەکانی خودایە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی‌و لەیەك نەچوونو جیاوازی زمانی پێ ئاخافتنو رەنگ‌و رووتان، کە بێگومان لەمەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ زانایان.

ئیتر وردە وردە بەپێی گەشەی مرۆڤایەتی، راگەیاندنیش گەشەی کردووە، تا وای لێهات ئامرازگەلی جۆراوجۆر بۆ گەیاندنو گواستنەوە پەیابوون، کەوا دەبنیین ئەمڕۆ راگەیاندن رۆڵێکی گرنگ‌و کارا دەبینێت لە ژیانی گەلانی دنیاداو کاریگەری زۆری لەسەر خەڵکی هەیە بەگەورەو بچووك‌و ژنو پیاو، راگەیاندن رۆڵە تەقلیدی‌و سنووردارەکەی خۆی تێپەڕاندووەو تەنیا لە چوارچێوەی گواستنەوەی هەواڵو زانیارییەکاندا نەماوەتەوە، بەڵکو پەلی کێشاوە بۆ گشت بوارە جیاوازەکانی ژیانی خەڵك‌و وردەکارییەکانی، راگەیاندن ئەمڕۆ لە شێوەی چەندین کۆمپانیای تۆڕ ئامێزدا هەنگاو دەنێ‌و بەشداریی دەکات لە دروستکردنی رای گشتی‌و بڕیاری سیاسییدا، بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیای هاوچەرخیشەوە راگەیاندن پێشکەوتنێکی سەرسوڕهێنەری بەخۆوە بینیوەو بووەتە پێوەری پێشکەوتنو گەشەکردنی هەر وڵاتێك لە رووی شارستانی‌و زانست‌و رۆشنبیرییەوە، بۆیە دەبینین سەرجەم وڵاتان بە تایبەت وڵاتە پێشکەوتووەکان گرنگی‌و بایەخی تایبەت بە راگەیاندن دەدەنو پارەی زۆرو زەبەنە لە پێناو پێشخستنی کەناڵەکانی دا خەرج دەکەن. زۆر گەلو نەتەوەی ئەم جیهانە بە هۆی راگەیاندنەوە بوونە خاوەنی دەستکەوتی گەورەو مەزن، زۆریشیان بەهۆی راگەیاندنەوە دووچاری کارەساتی گەورەو ترسناك و شەڕوشۆڕو مەینەتی بوونو زۆرجاریش زلهێزانو رژێمە دەسەڵاتدارەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان و ئامانجەکانیان قۆستوویانەتەوە.

هەر لە رێگەی راگەیاندنەوە بوو کە لە سەدەی رابردوودا ـ بەتایبەت لە نیوەی دووەمیدا ـ هێرشێکی ئیعلامی گەورە وەڕێخرا دژ بە جیهانی ئیسلامی‌و زانایانی ئیسلام لەلایەك‌و بۆ پڕوپاگەندەکردنو جوانکردنی رووخساری هێزە ئیمپریالیستەکان لەلایەکی ترەوەو بۆ دروستکردنی بازاڕی تایبەت بە کاڵاو کەلو پەلەکانیان بە هەموو جۆرەکانییەوە ـ بە تایبەت جوانکاریی ـ لە جیهانی ئیسلامییدا، فیلمە تەلەفزیۆنییەکان بە گشتی هی رۆژهەڵات‌و

[1] (الروم: ٢٢).

رۆژئاوابوون کە لاوانی لە کچو کوڕ کەمەندکێش ئەکردو دووری ئەخستنەوە لە کاری جددیو بنیاتنەرانە و زانستو زانیاریو بەرهەمهێنان ـ بە ئێستاشەوە ـ، رۆڵێکی زۆر گەورەشیان بینی لەبێ ئاگاکردنو دوورخستنەوەیان لە ناسنامەو فەرهەنگو تایبەتمەندییەکانیانو کەوتنە ژێر کاریگەریی کلتورو فەرهەنگی ئەوان، تەنانەت وەستان بە ئاراستەی دژایەتی کردنی مێژوو و دابو نەریتو کلتوورو شوێنەوارە بەهادارەکانیانو رەوشتو ئاکارە بەرزەکانیان کە جێگەی رێزو سەربەزییان بووە لە دێرزەمانەوە!!.

رۆژگارێك رۆژنامەو گۆڤارەکان شانازییان بەوەوە دەکرد کە پێشەنگی لاوانو سەرقافڵەی جەماوەرن لە روو پێ وەرچەرخاندنیان بەرەو دوو بلۆکی خۆرهەڵاتو خۆرئاواو لەدوورەوە دەهۆڵ بۆ کوتانیان.[1]

هەروەك دەزانین لە رێگەی راگەیاندنەوە بلۆکی خۆرئاوا توانی شکست بە بلۆکی خۆرهەڵات بێنێو سەرکەوێ بەسەریا دوای دەیان ساڵ لە جەنگی سارد لە نێوانیاندا، زانای ئابووری ناسو بواری راگەیاندن (هارولد ئەدا فرانیس) دەڵێت: "دەتوانین قۆناغەکانی گەشەکردنی ژیاریی لە خۆرئاوادا بە گەشەکردنی هۆکانی راگەیاندن لەو قۆناغانەدا جیابکەینەوە".[2]

ئەمڕۆش شەڕی راگەیاندن شەڕێکی بەردەوامەو دەکرێ بوترێ کە شەڕەکانی داهاتووش راگەیاندن رۆڵێکی سەرەکی تیایاندا ئەبینێ بەرلە هۆکانی تری سیاسیو ئابووری.

هەر لەبارەی بایەخو گرنگی راگەیاندنو رۆژنامەوانیو رۆڵی لەورژاندنی رای گشتیو جەماوەرداو ترسی زۆردارو دیکتاتۆرو دەسەڵاتداران لێی، وتەکەی (ناپلیۆن) بە نموونە دەهێنرێتەوە کە خۆی داگیرکردنو دەست بەسەراگرتنی هەموو دنیای لەکەللەدابوو کە وتوویەتی: "سێ رۆژ نامە لەسەد هەزار سەرباز زیاتر دەمترسێنن".

هەر لە رۆڵو کارتێکردنە سلبییەکانی راگەیاندن دەتوانین ئاماژە بە راگەیاندنی کوردی بکەین لە کاتی شەڕی ناوخۆی کوردستانی عێراق بە تایبەت راگەیاندنی حیزبە شەڕکەرەکان

[1] ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی، دەزگاکانی راگەیاندنو خواستی خەڵك، رۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە، ٣٤٩، رۆژی ٢٠٠١/٨/٣، ل٤.

[2] کۆژیر، چەند سەرنجێك لە راگەیاندنی رۆژئاوا، رۆژنامەی (راپەرین) ژمارە ١٢، رۆژی ١٩٩٨/٤/٢٠، ل٦.

لە نەوەدەکانی سەدەی رابردوو کە هانی کوشتنو توندوتیژیو رقو تۆڵەسەندنەوەی ئەدا کە ئاکامی زۆر خراپو ترسناکی لێکەوتەوە.

## جۆرەکانی راگەیاندن

راگەیاندن بەپێی ئەو دابەشکردنەی قوتابخانەی (موینخی)ی ئەڵمانی بۆ پۆلێن کردنی جۆرەکانی راگەیاندنی کردووە،[1] دابەش دەبێت بۆ چوار جۆر:

١ـ راگەیاندنی خۆرسکی (**فطری**) (Primitive Information):

بریتییە لەو راگەیاندنەی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا هەبووە کە لە رێی خۆرسکییەوە بە هەندێ راستی گەیشتوون، وەك زانینی شوێنی ئەستێرەو ناسینەوەی وەرزەکانی ساڵ.

٢ـ راگەیاندنی رۆژانە (یومی) (Daily Information):

بریتییە لەو راگەیاندنەی رۆژانە هاووڵاتی لە کاتی تێکەڵاوی لەگەڵ کەسانی دی یان لە ماڵەکەی خۆی یاخود فەرمانگەکەی یا رێگەوبان و بە هۆی هەواڵ پرسینی دۆستو خزمو کەسو کارو هاورێیانی دەیگاتێ.

٣ـ راگەیاندنی سۆزداریی (**عاطفي**) (Emotional Information):

راگەیاندنی سۆزداری ئەوەیە لە رێی وروژاندنی سۆزو لایەنە عاتیفییەکانی مرۆڤەوە بەرامبەر ببزوێنرێت بۆ مەبەستێکی دیاری کراو.

٤ـ راگەیاندنی هۆشمەندیو ژیری (عقلی) Mental Information:

ئەو راگەیاندنەیە کە لەگەڵ ژیریو هۆشی مرۆڤدا دەدوێو لەسەر بنەمای راستییەکانو بە پشتبەستن بە ژمارەو ئامارو سەرژمێرییو زانیارییە دروستەکان، بنیات دەنرێ، ئەم راگەیاندنە لایەنی بابەتی زاڵە بەسەر لایەنی خودیو زاتییدا، پێچەوانەی جۆری سێیەم کە لایەنی خودی تیایدا زاڵە بەسەر لایەنی بابەتییدا.

لەلایەکی ترەوە راگەیاندن دابەش دەبێت بۆ دوو جۆری حیزبیو حکومی و سەربەخۆ یان ئەهلی، یەکەمیان حیزب یان دەسەڵات ئاراستەی دەکاتو زیاتر رەنگدانەوەی ئەوی پێوە دیارە، دووەمیشیان خەڵکانی دەرەوەی دەسەڵات سەرپەرشتی دەکەنو سەربەخۆن، ئیدی مەسەلەی ئیدیعاکردنی سەربەخۆیی و بێلایەنی لە راگەیاندندا تەنیا بانگەشەیەکی تیۆری

[1] **هەڤاڵ ئەبوبەکر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥ـ ٢٦.**

بێت وەك هەندێك بۆی دەچن یاخود بە فیعلی راگەیاندنی سەربەخۆو ئەهلی بوونی هەبێ، یا سەربەخۆبوونەکەشی رێژەیی بێت، ئێرە جێگای باسکردنی نییەو حوکمدانی لەسەر بۆ خوێنەر جێدێلێن.

## بەشەکانی راگەیاندن

لە رووی هۆکانەوە، راگەیاندن لەمانەی خوارەوە پێکدێت:

أ ـ هۆکانی راگەیاندنی نووسراو و چاپکراو:

کە رۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەو کتێبو نامیلکە دەگرێتەوە، هەروەها ئەو پەیام و نامانەش دەگرێتەوە کە دەنووسرێنو دەنێردرێن بۆ ئەو کەسەی مەبەستە ئاگادار بکرێتەوە، وەك ئەوەی قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە کە سولەیمان پێغەمبەر (سلاوی خوای لەسەربێت) نامەیەکی نووسیوەو داویەتی بە پەیامنێر (پەپۆسلێمانە) تا بیگەیەنێ بە(بەلقیس)ی شاژنی یەمەن: (**اذْهَب بِّكِتَابِي هَذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ * قَالَتْ يَا أَيُّهَا المَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ * إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ**)[1]. واتە: برۆ بەم نامەوەو بۆیان بهاوێژە ئینجا هەندێك دووركەوەرەوە لێیان و بنوارە وەلامیان چییە؟ (بەلقیس) وتی ئەی گەورەو پیاوماقوڵەکان!، من نامەیەکم بۆ هاوێشتراوەو نێردراوە کە زۆر بەرێزو گرنگە، کە لە سولەیمانەوەیەو بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبانە، (دەڵێ) نابێ خۆتان لەمن بەرزترو زلتر بزانن و بە مسوڵمانی وەرن بۆ لام.

پێغەمبەری ئیسلام موحەممەدیش (ﷺ) چەندین نامەی نووسی و ئاراستەی سەرکردەو پادشاکانی سەردەمی خۆی کردو داوای لێکردن مسوڵمان بن، تا هەنووکەش سوود لەم شێوازە وەردەگیرێت.

هەروەها ئەم بەشە پۆستەرو نەخشەو وێنەی فۆتۆگرافی و ئاگادارینامەش دەگرێتەوە.

ب ـ هۆکانی راگەیاندنی بیستراو:

وەك رادیۆو تەلەفزیۆنو کاسێتو ریکۆردەرو تەلەفۆنو وتاردان (جا وتاری رۆژی هەینی بێت یان هی تر).

---

[1] (النمل: ٢٨ـ ٣١).

ج ـ هۆكانی راگەیاندنی بینراو:

وەك تەلەفزیۆنو سینەماو سەتەلایتو ئینتەرنێتو پێشانگاو شانۆو نمایشكردنو وێنەو شتە نووسراوو چاپكراوەكان.

## چەمكی راگەیاندنی ئیسلامیی

ئەگەر هەر بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیاو ئایینێك راگەیاندنێكی هەبێت، بێگومان ئیسلامیش وەك ئایینێكی خوایی و كۆتا پەیام، خودان راگەیاندنی خۆیەتی، وە ئەگەر راگەیاندنیش بە شێوەیەكی گشتی هەڵگری پەیامو ئامانجێكی دیاریكراو بێت كە رەنگدانەوەی بیروباوەڕو كلتورو ژیارو بەها باڵاكانی و بەرژەوەندییەكانی بێ، كە ئەخوازرێ بگەیەنرێتە نێوجەرگەی كۆمەڵانی خەڵك لە رێگەی ئەو هۆو ئامرازنەی لەبەردەستی دان، ئەوا بێشك راگەیاندنی ئیسلامیش خاوەنی پەیامی تایبەتی خۆیەتی كە پەیامی ئیسلامەو راگەیاندنێكە هەڵگری بیروباوەڕو خووڕەوشتو كلتورو ژیارو شارستانیەتی ئیسلامییەو ئەیگەیەنێ بە مرۆڤایەتی تاوەكو هەموو تاكێك لەو پەیامە پڕسۆزو میهرو رەحمەتە بەهرەمەند ببێت.

پاش ئەوەی پێناسەی راگەیاندنمان كرد، دەمانەوێ لێرەدا پێناسەی راگەیاندنی ئیسلامیی لە رووی زاراوەییەوە بكەین.

گەرچی تا هەنووكە پێناسەیەكی دیاریكراوو گشتگیرمان نییە بۆ راگەیاندنی ئیسلامیی ـ وەك ئەوەی من بیزانم ـ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زاناو لێكۆڵەرەوانی بواری راگەیاندنی ئیسلامیی چەند پێناسەیەكیان بۆ راگەیاندنی ئیسلامیی كردووە .

تەیسیر مەحجوب ئەلفتیانی لە كتێبەكەی (**مقومات رجل الإعلام الإسلامی**)[1]دا، دوو پێناسەی باسكردووە كە لێرەدا دەیاننووسین:

**پێناسەی یەكەم:**

راگەیاندنی ئیسلامیی بریتییە لە: "ئاشناكردنی جەماوەر بەشێوەیەكی گشتی بەراستییەكانی ئایینیی ئیسلام كە لە قورئانو سوننەتەوە - راستەوخۆ، یان ناراستەوخۆ - سەرچاوەیان گرتووە، لەمیانەی دەزگایەكی راگەیاندنی ئایینی پسپۆڕ، یان گشتییەوە،

[1] تیسیر محجوب الفتیانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩ـ ٣٠.

بەهۆی ئەو کەسەوە کە هەڵدەستێ بەکاری پەیوەندیکردنەوە کە پاشخانێکی فراوانو قووڵی لەمەڕ ئەو پەیامەوە هەبێ کە ئەیگەیەنێ، ئەمەش لە پێناو دروستکردنی رای گشتی دروستو رەوا کە حەقیقەتە ئایینییەکان تێبگاتو دەرکیان بکاتو پێیانەوە کاریگەر بێتو لە باوەڕو خواپەرستی و مامەڵەکانی دا رەنگ بداتەوە".

**پێناسەی دووەم:**

راگەیاندنی ئیسلامیی بریتییە لە "روونکردنەوەی راستیو جوان و شیرینکردنی لای خەڵك، بەهەر هۆو رێگاو شێوازێکی زانستی رەوا و مەشروع، لەگەڵ پەردە هەڵماڵینو ئاشکراکردنی رووی ناهەقو ناشیرینکردنی بەهەر رێگەیەکی مەشروع، بە مەبەستی راکێشانی بیرو هۆشەکان بەلای راستی داو بەشداری پێکردنی خەڵك لە خێروبێرو رێنماییەکانی ئیسلامو دوورخستنەوەیان لە ناهەق، یان بڕینی بەڵگەو بڕوبیانوویان".

گەر سەیری ئەم پێناسەیە بکەین، دەبینین لە پێناسەی یەکەم وردترو گشتگیرترە، چونکە پێناسەی یەکەم جگە لەوەی کە دوورو درێژە، بۆ جەماوەریش ئاراستە کراوە نەك تاکەکان، گەرچی پەیامی ئیسلام بۆ تاكو کۆمەڵە بێ جیاوازی، پاشان دەزگاو وەسیلە ناکرێ بە ئایینی ناوزەد بکرێ.

کەوابوو پێویستمان بەپێناسەیەکی تری وردترو قوڵتر هەیە بۆ راگەیاندنی ئیسلامیی، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین راگەیاندنی ئیسلامیی ئەو راگەیاندنەیە کە خاوەن مەبدەئەو لەسەر بنەمای راستگۆیی و دادپەروەری دامەزراوەو راگەیاندنێکی واقیعییە، دوور لە چەواشەکاریو کردارو گوفتار پێکەوە گرێ ئەدات، هەروەها خاوەن ئیلتزامێکی ئەخلاقییە کە لە روانگەی بنەماو بنچینە شەرعییەکانەوە، بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگا دەخاتە پێش بەرژەوەندییە تایبەتییەکانەوە.

بانگەوازیش دەچێتە خانەی کاری راگەیاندنەوە بەپێی لێکدانەوەکانی پسپۆڕانی بواری راگەیاندنو پەیوەندی کردن بە جەماوەرەوە، چونکە بانگەواز بریتییە لەو کارەی ژیری و هۆشو بیری مرۆڤ ئەدوێنێو پشت بە بەڵگەو دەلیل و مەنتیق دەبەستێو کار لەسەر دۆزینەوەی راستی دەکات، کاتێکیش سەیری پێناسە زانستییەکەی راگەیاندن دەکەین، دەبینین خۆی لە چەمکی بانگەواز بە مانا رەسەنەکەی نزیك دەکاتەوە.

بەگشتی ئەمەی سەرەوە هێڵە گشتییەکانی راگەیاندنی ئیسلامیی دەردەخات، کە تێڕوانینی ئیسلام بۆ راگەیاندن ئاوایە، راگەیاندنێك شەفافیەتو راستگۆییو وردبینیو

بابەتیبوون لەخۆ بگرێ، بەشێوەیەك وەك وەسیلە، نەك ئامانج سەیری بکرێ، پێچەوانەی ئەمە، ناتوانرێ بەراگەیاندنی ئیسلامیی ناوزەد بکرێ.

لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا بەدرێژی دێینە سەر باسکردنی راگەیاندنی ئیسلامییو گرنگیو خەسڵەتو ئەرکەکانی.

## راگەیاندن لە کوردستاندا

راگەیاندن لە کوردستاندا، تا هەنووکە لە سنوورێکی بەرتەسکدایەو ئەو سنوورەی تێنەپەڕاندووە، ئەویش چوارچێوەی ئایدۆلۆژیاو بیروباوەری حیزبایەتییە.

گەرچی سەدەیەك زیاتر بەسەر مێژووی دەست پێکردنی رۆژنامەگەریی کوردییدا رەت بووەو راگەیاندنی کوردیی پێشکەوتنێکی باشو بەرچاوی بەخۆوە بینیوە کە دەیان کەناڵو دەزگای هەواڵ گەیاندن حزووریان هەیە، بەتایبەت لەسەر ئاستی رۆژنامەوانییەوە کە ئەو هەموو رۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەیە لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا (رۆژانە، هەفتانە، مانگانەو وەرزی) بڵاودەبنەوە، لە رووی تەقەنی چاپکردنی نوێو نەخشەسازیشەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، لەتەك بوونی دەیان کەناڵی رادیۆو تەلەفزیۆنو سەتەلایتی کوردییو سایتی ئینتەرنێتیش، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هێشتا راگەیاندن نەیتوانیوە ئەدای پەیامی خۆی بکاتو مەسەلەی گەلی کوردستان وەك گەلێکی ستەملێکراو و وڵات دابەشکراو، وەك پێویست بەجیهان و دەوروبەری خۆی بگەیەنێ و تایبەتمەندی ئەو گەلە بخاتە روو، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك، لەوانە زۆربەی دەزگا راگەیاندنەکان هەنووکەش حیزبو ئایدیۆلۆژیایەك زاڵە بەسەریدا، یان لە پشتەوەیەتی، زۆریش لەو حیزبو لایەنانەی تەبەنی چەند بیروباوەڕو هزرێکی هێنراوی کردووە بێئەوەی بە تەواوی بنەمای فیکری ئەو بیردۆزو ئەفکارانە بزانێ، وەك رێبازی مارکسی ـ لینینی و سۆسیالیستیو دیموکراسیەتی شۆڕشگێڕی و تاد، کە بە واقیعی کۆمەڵگای کوردەواری نامۆنو ئاوێزانی نابن.

لە لایەکی تریشەوە راگەیاندنی حیزبەکان، زیاتر تایبەتمەندی حیزبی خۆیانو چالاکی و کاروبارەکانیان دەخاتەروو و پتر لە خزمەت بەرژەوەندی تایبەتیدا کاردەکەنو دەیانەوێت شەرعییەت بە خۆیان بدەن هەریەکەو لەسەر حیسابی حیزبو لایەنی تر و هەندێ جار لەسەر حسابی بەرژەوەندی میللەتیش، بۆیە بە ئاشکرا هەست بە هەژموونو هەیمەنەی حیزبایەتی دەکرێ بەسەر راگەیاندندا لە کوردستانو زۆربەی ئەو کادیرانەی کاری راگەیاندن

دەکەن، پسپۆڕنین‌و رەنگە زۆریان ئەزموونیشیان نەبێ‌و تەنێ لەسەر بنەمای حیزبی بوون دانراون، هەموو ئەوانە وای کردووە کە راگەیاندن لە کوردستاندا پلانێکی ستراتیژی نەبێت‌و نەتوانێ پرۆژەیەکی رۆشنبیریی نەتەوەیی کە ببێتە هۆی یەکبوونی گشت پێکهاتەو لایەنە سیاسییەکان دابرێژێت، بەشێوەیەك لەخاڵە هاوبەشەکان‌و مەسەلە چارەنووسسازەکاندا بەیەك گوتارەوە لەدەرەوەو ناوەوە دەرکەوێت.

# بەشی دووەم:
# راگەیاندنی ئیسلامیی

## ڕێخۆشکردنێك

زۆرجار ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە كە ئاخۆ راگەیاندنی ئیسلامیی‌و نائیسلامیی هەیە؟ یاخود تەنیا یەك راگەیاندن هەیە، مەگەر هونەری راگەیاندن‌و هۆكانی‌و ئەركەكانی‌و دیمانەی ئیعلامی‌و ریپۆرتاژو هەواڵ‌و كاری رۆژنامەوانی لە ولاتێكەوە بۆ ولاتێكی ترجیاوازی هەیە، لە كوردستان بێ، یان لەولاتێكی ترو قارەیەكی دیكە و لە دەزگایەكەوە بۆ دەزگایەكی تر؟

بۆ وەلامی ئەو پرسیارە و لقەكانی پرسیارەكەی سەرەوە، هەوڵ ئەدەین لەم بەشەدا وەلامەكە لە میانەی چەند تەوەرەیەكدا بدەینەوە، لەوانە گرنگی‌و بایەخی راگەیاندن لە ئیسلامدا، خەسڵەت‌و تایبەتمەندی راگەیاندنی ئیسلامیی‌و ئەركەكانی، پاشان دێینە سەر بنەما شەرعییەكانی كاری رۆژنامەوانی‌و پەیامنێر، لەگەڵ باسكردنی وتاربێژیی‌و وتاری هەینی وەك بەشێك لە راگەیاندنی ئیسلامیی، هەروەها نامەو پەیام، لە كۆتاییشدا تیشكێك دەخەینە سەر راگەیاندنی ئیسلامیی لە كوردستان.

### گرنگی و بایەخی راگەیاندن لە ئیسلامدا

مەبەست لە ڕاگەیاندنی نوێی ئیسلامیی گوزارشت كردنە لە ژیار و بیروباوەڕی ئیسلام و پەیامەكەی بە هۆی تەكنەلۆژیای تازەی ئەلیكترۆنییەوە بۆ پەیوەندیكردن بەجەماوەرو خەڵكییەوە بە پێی بیردۆزی نوێی راگەیاندن، لە پێناو رۆشنكردنەوەی هزری ئیسلامیی‌و گەیاندنی بە خەڵك، كەوابوو راگەیاندنی ئیسلامیی وەك هەڵگری بیروباوەڕو ژیارو كلتورو خوورەوشتی ئیسلامیی، بە باڵیۆزی راستەقینەی پەیامی ئیسلام دێتە ژمار كە دەیەوێت لە روانگەی ئایەتەكانی **(اقْرأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ * الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ * عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ)**.[١]

---

1 - (العلق: ١ـ ٥).

پەیامە پیرۆزەکە بگەیەنێ بە مرۆڤایەتی کە بەزەیی‌و بەختەوەری‌و خۆشبەختی دین‌و دنیایانی تێدایە (**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ**).[1] واتە: ئێمە تۆمان نەناردووە مەگەر بۆ ئەوە کە بەزەیی‌و چاکەیەك بیت بۆ هەموو جیهانیان.

جا لەو سۆنگەیەوە کە پەیامی ئاسمانی لە رێگەی راگەیاندنەوە بە گوێی مرۆڤایەتیدا ئەدرێ‌و رۆشن دەکرێتەوە بەراستی‌و دروستی‌و بەوشەی جوان‌و پاك‌و بەپێی نەخشەیەکی گونجاوو دوور لە چەواشەکاری‌و چاوبەستەگی و هەر هێرش‌و پەلامارێکی ناڕەواو هەولێکی شێواندنیش لە رێگەی راگەیاندنەوە بەرپەرچ‌و وەلام دەدرێتەوە، بۆیە ئایینی ئیسلام گرنگی زۆری داوە بە راگەیاندن‌و بایەخی تایبەتی پێداوە، مسولمانانیش لە هەر چەرخ‌و بارودۆخێکدا و بەپێی بەرژەوەندی و میکانیزمەکانی سەردەم گرنگییان پێداوە.

گەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو سەیر دەکەین پێغەمبەرانی خوا (سلاوی خوایان لەسەربێت) هەستاون بەکاری راگەیاندنی پەیامی خوا بە نەتەوەکانیان‌و وەلامی تۆمەتەکانیشیان ئەدایەوە کە لە لایەن دوژمن‌و ناحەزەکانیانەوە ئەدرایە پاڵ خۆیان‌و ئایینەکەیان بۆ دوورخستنەوەی خەڵکی لێیان.

ئیبراهیم پێغەمبەر بە بەڵگەی راست‌و دروست‌و مەنتیقی، رووبەڕووی گەلەکەی بوویەوەو تێیگەیاندن کە ئەو پێغەمبەری خوایەو پەیامی ئەوی بۆ هێناون‌و رێگای راستی نیشان دان‌و پێیوتن کە ئەو رێگایەی ئێوە نادروستەو نابێ لە غەیری خودا داروبەردو شتی لەو جۆرە بپەرسترێ، بەلام ئەوان بەسەرکردایەتی فیرعەون کە داوای خوایەتی ئەکرد، بەرەنگاری بوونەوەو پەیامەکەیان بەدرۆخستەوە، بەلام بێ هیچ بەڵگەیەکی لۆژیکی‌و زانستی‌و بێ پەنابردنەبەر ئەقڵ‌و وتووێژکردن، سەرەنجام خستیانە ناو ئاگرەوە بۆ ئەوەی بسووتێ‌و هەمیشە دەنگی راستی کپ ببێت، وەلێ خودا رزگاری کردو ئەوان تیاچوون.

بە هەمان شێوە نوح پێغەمبەرو موسا و عیسا و پێغەمبەرانی تریش، لە کاتی راگەیاندنی پەیامی خوادا ئازاردراون‌و بەراگەیاندنی چەواشەکارانەو نادروست وەلامدراونەتەوە لەلایەن نەتەوەو گەلەکانیانەوە، گەرچی لەراستی‌و دروستی پەیامی خوا گەیشتبوون، بەلام لەرووی رق‌و کینەو رکابەرێتی‌و خۆبەزلزانینەوە رووبەڕوویان دەبوونەوەو بانگەوازەکانیان قبوڵ نەدەکرد.

---

[1] - (الأنبیاء: ١٠٧)

پێغەمبەری خۆشمان موحەممەد (ﷺ) بەرلەوەی چەك بەكاربێنێ، بەوتەی شیرین‌و بانگەوزاە پاكەكەی خەڵكی بانگ دەكرد بۆ پەیامەكەی و پاشانیش بەكردارو تەرجومەی عەمەلی، چونكە خودا وا فەرمانی پێكردبوو (**يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ**).[١] واتە: ئەی پێغەمبەر! هەر شتێكی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزیوە، رای گەیەنە، گەر وانەكەی پەیامەكەت رانەگەیاندووە، خودا لە خەڵكیت دەپارێزێ، وە خودا كۆمەڵی بێبڕوایان شارەزای راستە رێ ناكات.

وێڕای بەرەنگارییەكی توندی دوژمنانەكانی و بەرهەڵستكارانی پەیام‌و ئاییینی تازەو بەكارهێنانی راگەیاندنی چەواشەكارانە بەوە كە موحەممەد شێت بووە، وە یان جادووگەرە، یان شاعیرو فاڵچییەو جۆرەها پڕوپاگەندەی ترو بڵاوكردنەوەیان بەنێو جەماوەردا و جۆرەها ئەشكەنجەدانی دەروونی‌و جەستەیی خۆی‌و هاوەڵەكانی‌و هەڕەشە لێكردنی‌و هەوڵی تیرۆركردنی چەند جارێك‌و شەهیدكردنی چەند هاوەڵێكی و گرتن‌و زیندانی كردن‌و ئەشكەنجەدانیان، هەروا فشاری زۆر خستنە سەری، فشاری كۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و سەرپشك كردنی لە نێوان سامان‌و دەسەڵات‌و هەر شتێكی تر كە بیەوێت بۆ ئەوەی واز لە بەجێگەیاندنی ئەركی راگەیاندن‌و بانگەوازەكەی بێنێت و چیتر نەیدا بە گوێی خەڵكیدا، سەرەڕای هەموو ئەوانەو سەرەنجام دەركردنی لە مەككەو كۆچكردنی و جەنگ لەگەڵدا كردنیشی، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) كۆڵی نەداو ئارامی گرت‌و بەردەوام بوو لەسەر راگەیاندنی پەیامەكەو بڵاوكردنەوەی بەهەر هۆو میكانیزمێك بۆی مەیسەر بوو بێ، چونكە پەیامێكی راستەو هەرئەبێ بگەیەنرێ بێترس‌و بیم (**الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَداً إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيباً**).[٢] واتە: ئەو كەسانەی پەیام‌و فەرمانەكانی خوا دەگەیەنن‌و لەو دەترسن و جگە لە خودا لە هیچ كەسی تر ناترسن، وەبەسە خودا حەسێبگەر بێ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هەموو ناوچەكان كەسانێكی دەنارد وەك راگەیاندنكار یان وەك راگەیەنەر (مبلغ) ێك تا پەیامەكە بگەیەنن بە خەڵكی ئەو وڵات‌و دەڤەرە، سوودیش وەرگیراوە لە شێوازی گفتوگۆو وتارو شیعرو هەڵبەستیش بۆ هەمان مەبەست.

---

[1] - (المائدة: ٦٧).

[2] - (الأحزاب: ٣٩).

دواتریش له چاخەکانی تری فەرمانڕەوایی ئیسلامدا گرنگی زۆر به بواری راگەیاندن دراوەو زاناو داناکان مومارەسەی ئەو کارەیان کردووه، ئەمڕۆش مسوڵمانان له وڵاتانی ئیسلامیو رەوەندە ئیسلامییەکان له دەرەوە، بایەخی زۆر ئەدەن به راگەیاندنو بەدەیان و سەدان دەزگاو کەناڵی راگەیاندن و رۆژنامەو گۆڤارو سایت... خراونەتەگەڕ بۆ بنیاتنانەوەی کەسایەتی ئیسلامیی نەتەوەی ئیسلامو پەروەردەکردنو رۆشنبیرکردنی تاکەکانی له روانگەی پەیامی ئیسلامەوەو بەشێوەیەکی زانستیو هاوچەرخو هۆشیارکردنەوەیان له پیلانو راگەیاندنی چەواشەکارانەی ناحەزانی ئیسلامو مسوڵمانان که دەیانەوێت مێژوویان بشێوێننو لاوو گەنجەکانیان چەواشه بکەنو بیروباوەڕی راستو مرۆڤانەیان لەق بکەن.

## خەسڵەتو تایبەتمەندییەکانی راگەیاندنی ئیسلامیی

ئیسلام وەك ئایینێکی خوایی، جیهانبینی خۆی هەیه بۆ گشت بوارەکانی ژیان له هزری، رامیاری، بازرگانی، یاساو کۆمەڵایەتیو هونەری..، واته ئایینێکی گشتگیره تەنیا له گۆشەو چوارچێوەیەکی دیاریکراودا قەتیس نامێنێ، بەگشتیش هەر کاتێك راگەیاندن پابەندبوو به بەهاو خووڕەوشتو یاساو رێسا ئیسلامییەکان له حەڵاڵو حەرامدا، ئەوا دەبێته راگەیاندنێکی ئیسلامیی که باوەڕی به گشتگیری پەیامی ئیسلام هەیه، لەبەرامبەر راگەیاندنێك که ئەو باوەڕەی نییەو پێی وایه ئاین تەنیا پەیوەندی نێوان خوداو بەندەیەو دەبێ تەنێ له مزگەوت دابێ‌و ئەوەشی دەیەوێت دینداری بکات باڕوو له مزگەوت بکاتو لەبارەی شتی ترەوه نەدوێت، چونکه (ما لقیصر لقیصر، وما لله لله)! به واتای جیاکردنەوەی ئاین له سیاسەت کاتێك هەست بکەن ئیسلام و بانگەوازەکەی دەبێته هەڕەشه لەسەر دەسەڵاتدارانو بەرژەوەندییەکانیان.

بەڵام کاتێك دەبینن له تێکەڵاوکردنی ئاین و سیاسەتدا و له ڕۆڵ بینینی مزگەوتو زانایانی ئایینیدا بەرژەوەندییەکی کاتی هەیه، پشتگیری لێدەکەنو کۆمەڵێك مەلاو ئامۆژگاریکار و (موفتی)ش راست دەکەنەوه بۆ گونجاندنی بابەته ئایینییەکه لەگەڵ سیاسەتو هەڵوێستی دەسەڵاتدارەکانا، و حەرامکردنی ئەوەی بیانەوێ حەرام بێتو حەڵاڵ کرنی ئەوەی بیانەوێت حەڵاڵ بێت، گەر سەرۆكو پادشاو ئەمیرو دەسەڵاتدار ویستی شەڕ بەرپا بکات لەگەڵ لایەن، دەوڵەت، کۆمەڵێکا، ئەوا شەڕ دەبێته فەرزی عەین، و ئاشتی حەرام دەبێت، خۆ گەر سیاسەتەکەی به ئاقاری ئاشتیدا گۆڕا، ئەوا فەتوای پشتگیری و

پیرۆزبایی لێکردنی بەناوی ئایینو ئایەتی قورئانەوە بۆ دەردەچن، وەگەر ویستیان بێنەدەنگ بەدەنگ دێنو کاتێکیش ویستیان بێدەنگ بن ئەوا کڕ دەبن و راستی دەشارنەوە.[1] هەروەك جارێکیان یەکێك لە زاناکان بۆ مێزگردێکی تەلەفزیۆنی بانگهێشت دەکرێ لەیەکێك لە وڵاتەکانا، بابەتی گفتوگۆکە سەبارەت بە دیاریکردنی سنووردارکردنی وەچە (تحديد النسل) دەبێت لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە، ئەو پیاوەی کە ئەرکی بەڕێوەبردنی مێزگردەکەی لە ئەستۆدا بوو، تووشی سەرسوڕمان و شۆك هات، کاتێ زاناکە پێی وت: ئایا ئامانج لە مێزگردەکە پشتگیری کردنە لە سنووردارکردنی وەچە، یان دژوەستانو رەتکردنەوەی بۆ ئەوەی خۆمی بۆ ئامادە بکەم؟![2]

بەڵام لێرەدا پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان دوو جۆر راگەیاندندا کە لە پوختەی ئەوەی پێشەوەدا دەفامرێتەوە:

یەکەم: ئەو راگەیاندنەی کە دەدرێتە پاڵ دەوڵەتێك لەو دەوڵەتانەی ناو دەبرێن بە دەوڵەتی ئیسلامی یاخود ئەو راگەیاندنەی دەدرێتە پاڵ مسوڵمانان.

دووەم: ئەو راگەیاندنەی دەدرێتە پاڵ ئیسلام .

راگەیاندنی یەکەم، ناکرێ بە گشتی بە نوێنەری راگەیاندنی ئیسلامیی و گوزارشتکار لە بنەماو چەمكو ئامانجەکانی لەقەڵەم بدرێ، چونکە زۆربەی راگەیاندنەکانی جۆری یەکەم ـ بە تایبەت هی دەوڵەتە مسوڵمان نشینەکان ـ تێڕوانینێکی سلبییان هەیە بۆ ئیسلامو بەزۆریش لەسەر رێڕەوی راگەیاندنی خۆرئاوا دەڕۆن، وە ئەو راگەیاندنە خۆی ئەبوێرێ لەمەسەلە چارەنووسسازەکانی مسوڵمانانو پێ لەسەر مەسەلەگەلی لاوەکی و جێی بایەخی چەند توێژێکی تایبەت دادەگرێ و ئەتوانین بڵێین راگەیاندن لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا، بڵندگۆی دەسەڵاتو بەرپرسانی باڵایەو درزێکی گەورە لە نێوان ئەو راگەیاندنەو گەلەکاندا هەیە، بوونی ئەو چەند (بەرنامە ئایینییە) ش لە کەناڵو هۆکانی راگەیاندن لە جیهانی ئیسلامیدا لە ئاستی پێویستدا نییەو زیاتر مەسەلەگەلی جێ نیازی حکومەتەکان تیایاندا

[1] - رعد كامل الحيالي، الإعلام الإسلامي الواقع والحقيقة، مطبعة الخلود، الطبعة الأولي، بغداد، ١٤١٤هـ ـ ١٩٩٤م، ص٨ـ ٩.

[2] - د. يوسف القرضاوي، الصحوة الاسلامية بين الجمود والتطرف، مؤسسة الرسالة، الطبعة الأولى، ١٤٠٥هـ ـ ١٩٨٥م، ص٩٢.

دەخرێنە بەرباسو خواسو تاوتوێکردنو راگەیاندنی ئیسلامیی راستەقینە تیایاندا رەنگ ناداتەوە. بەڵام جۆری دووەمی راگەیاندن کە بە (راگەیاندنی ئیسلامیی) ناوزەدی دەکەین، بریتییە لەو راگەیاندنەی ئیسلام وەك بەرنامەو پرۆگرامی ژیان دەناسێنیو شانازی بەباوەڕو بەهاکانی دەکاتو هاوولاتی چاكو پاكو دڵسۆز بۆ ئایینو نیشتمانەکەی پەروەردە دەکات.

قورئانی پیرۆز راگەیاندنی پاكو راستی رەنگرێژکردووە لەمیانەی چەندین ئایەتی پیرۆزدا:[1]

نزیکەی (١٧٠٠) ئایەت لە بارەی راگەیاندن (**الإعلام**)ەوە لە قورئاندا هاتووە، تەنیا لە مادەی (ق و ل)دا، ئەمەش گرنگیو هەستیاری راگەیاندنو بانگەواز دەگەیەنێ، دەبینین خوای گەورە لە زۆر ئایەتدا بە راشکاوی داوا لە مسوڵمانان دەکات کە پەیامی خوا بە خەڵکی دیکە بگەیەننو رایگەیەنن: (**قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**).[2] واتە: بڵێ ئەی پێغەمبەر، ئەمە رێگای منە خۆمو ئەوانەی شوێنم کەوتوون بەبەڵگەو بەرچاو روونییەوە بۆ لای خوا بانگ دەکەم، خواش پاكو بێگەردەو من لەوانەنیم کە هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن.

وە خوا ستایشی بانگخوازو راگەیەنەری پەیامی خۆی دەکاتو دەفەرموێ: (**وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ**).[3] واتە: کێ لەو کەسە قسەی جوانترو بەرێو جێترە کە بەرەو خوا بانگەوازی دەکاتو خۆشیی کردەوەی چاكو پەسەند ئەنجام دەداتو دەڵێ منیش یەکێ لە مسوڵمانانم.

بەڵکو خوای گەورە وەسفی ئوممەتی ئیسلامیی وادەکات کە باشترین ئوممەتن (**كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْراً لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ**).[4] کە خوا دروستی کردوون، چونکە فەرمان بە چاکە دەکەن، کە ئەمە مەسەلەیەکی ئیعلامییە، رێ لە خراپە دەگرن،

---

[1] – بڕوانە: موسى زيد الكيلانى، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨ـ ٢٩. رعد كامل الحيالى، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤ـ ١٥.

[2] – (يوسف: ١٠٨).

[3] – (فصلت: ٣٣).

[4] - (آل عمران: ١١٠).

ئەمەش دیسان ئەرکێکی ئیعلامییە، و باوەڕتان بەخوا هەیە، پێغەمبەری ئیسلامیش دەفەرموێ: (**بلّغوا عني ولو آية، فرب مبلّغ أوعى من سامع**)،[1] واتە: لەمنەوە گەر ئایەتێکیش بێت رابگەیەنن، چونکە زۆر جار ئەو کەسەی پێی رادەگەیەنرێ لەو کەسە باشتر تێدەگات کە دەبیستێو ئامادەی پەیام گوتنەکەیە.

هەموو ئەوانە بەڵگەی ئەوەن کە ئیسلام ئایینی راگەیاندنو بانگەوازو هەواڵو دەنگوباسو بڵاوکردنەوەی پەیامی راستو سوودبەخشو گەیاندنیەتی بەخەڵك، بۆ رێنماییکردنیانو ئاراستەکردنیان بەرەو چاکەو چاکەخوازی. بۆیە لێرەدا گرنگترین تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی راگەیاندنی ئیسلامیی دەخەینە ڕوو:

١ـ راگەیاندنی ئیسلامیی پشت بە قورئانو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەبەستێتو شوێن شەریعەتی ئیسلام دەکەوێ لە هەموو بوارەکانی ژیانداو بەها ئەخلاقی و سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو بازرگانییەکانی لێوەردەگیرێ و هەوڵی پارێزگاری لێکردنیان ئەدات بە بەکارهێنانی هۆو تەکنەلۆژیای نوێ بۆ گەیاندنی پەیامی خوا بە خەڵکیو تێگەیاندنیان بەو رێگایانەی پەسەندن لە شەریعەتی ئیسلامدا، واتە رێبازی میکاڤیلییانە ناگرێتە بەرو بۆ گەیشتن بە ئامانجو مەبەستی پیرۆز رێگای نامەشروع پەسەند ناکات.

راگەیاندنی ئیسلامیی بەم چەمكەو واتایە رۆڵێکی گەورەو پێشەنگ لەسەرکردایەتی کردنی کۆمەڵگای مسوڵمانو بڵاوکردنەوەی هۆشیاری ئیسلامییو ئاڕاستەکردنی رای گشتییدا دەبینێ و پەیامی خوا وەك رزگارکەری مرۆڤایەتی لە بێ بەندو باریو داڕووخانی رەوشتیو تیاچوون دەناسێنێ، ئەو پەیامەی کە پڕۆگرامێکی نەگۆڕی سەرچاوە گرتووی هەیە لە تێڕوانینو جیهان بینی گشتگیری ئیسلام بۆ بوونەوەرو مرۆڤو ژیان،[2] بەشێوەیەك کە هاوکات لەگەڵ هەموو پێشکەوتنێکی شارستانی بەرەوپێشەوە دەڕواتو گونجاوە بۆ گشت کاتو شوێنێك.

٢ـ راگەیاندنێکی پەیامدارە:

واتە راگەیاندنێکە لە خزمەت عەقیدەو باوەڕی ئیسلامییدایەو ئایینی ئیسلام وەك باوەڕو بەرنامەو یاسا دەناسێنێت کە سیستمێکە بنەما سەرەکییەکانی حوکمڕانی

---

1 – ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە.

2 – رعد كامل الحيالي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥ـ ١٦.

لەخۆگرتووە، ئەو سیستمەش خاوەن ئەرك‌و بەرپرسیارێتی گەورەیەو هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگا ڕێکدەخات لە (رەوشتی، کۆمەڵایەتی، مەعریفی، .. هتد)، ئەم راگەیاندنە ئیسلامییە، گەرچی زیاتر لە چواردە سەدە بەسەر لەدایکبوونیدا رەت بووە، هێشتا ئەرکی خۆی لە بانگەوازکردن بۆ ئایینی خواو بەرپەرچدانەوەی هێرش‌و شاڵاوە ئیعلامییەکانی سەردەم جێبەجێ دەکات، ئەمڕۆ لەنێو ئەو هەمووە ململانێ فیکری‌و ئایدیۆلۆژی‌و لادانە عەقیدی‌و داڕووخانەی مرۆڤایەتی ئەم چەرخە رووبەڕووی بۆتەوە، راگەیاندنی ئیسلامیی لەسەریەتی ژیارو شارستانییەتی ئیسلامیی و بەهاو خزمەتەکانی‌و گرنگترین دەسکەوت‌و سوودەکانی لە مێژوودا بۆ مرۆڤایەتی شرۆڤە بکات‌و بناسێنێ‌و ئەو پڕۆژەو دەسکەوتانەی دەوڵەتی ئیسلامیی لای جەماوەر شیرین بکات‌و ئیجابیاتەکان کە زۆر زۆرترن لە سلبیاتەکان لە مێژووی حوکمڕانی مسوڵماناندا بەنەوەی نوێ رابگەیەنێ، نەك بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو هەوڵانەی لە راگەیاندنی ترەوە دەدرێ بۆ ناشیرینکردنی مێژووی ئیسلامی‌و لەکەدارکردنی و سەرەنجام لێدانی پڕۆژەی ئیسلامیی‌و پەیامەکەی بە گشتی.

**٣ـ راگەیاندنی ئیسلامیی هۆکارێکە لە خزمەتی باوەڕدا:**

واتە ئیسلام وا دەڕوانێتە راگەیاندن کە وەسیلەیەکە بۆ خزمەتی پەیامی ئیسلام‌و گەیاندنی راستی بەخەڵك، نەك راگەیاندن لە خزمەتی کەسێکی تایبەتدا بێت جا ئەو کەسە بەرپرس بێت، زاناو فەقیهێك بێت، یان فەرمانڕەواو خەلیفەیەك بێت، یا ئەوەتا لە خزمەت بنەماڵەی دەسەڵاتدارو رژێمەکەیا بێت، هەروەك واقیعی ئەمڕۆی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامیی وادەبینرێت، کەوابوو راگەیاندن (ئامانج) نییەو نابێ باوەڕ بخرێتە خزمەتی راگەیاندن کە زۆرجار بە بەڵگەگەلی زۆرەوە پاساو بۆ راگەیاندنەکان ئەهێنرێتەوە لەوەی کە رایدەگەیەنن‌و دەیلێن‌و بۆ خۆیان دەیشەرعێنن.

کە دەڵێین راگەیاندن وەسیلەیەکە بۆ خزمەتکردن بە ئیسلام‌و پەیامی راست‌و رەوان، واتە دەبێ گشت کەناڵە جۆربەجۆرەکانی راگەیاندن بخرێنە کار بۆ بڵاوکردنەوەو گەیاندنی ئیسلام‌و دیدگای بۆ ژیان‌و بوارەکانی و رێزگرتنی لە مرۆڤ و مافەکانی و ژیری‌و لێهاتوویی‌و رێخۆشکردن بۆ قبوڵکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی‌و سیستم‌و رێبازەکەی لەلایەن نامسوڵمانەکانەوە لە ناوەوەو دەرەوەی جیهانی ئیسلامییدا، بۆیە دەبێ راگەیاندن هەموو کات‌و دەرفەتێك بقۆزێتەوەو بەشتی باش‌و سوودبەخش‌و ئامانجدار پڕی بکاتەوەو ئەو هۆو وەسیلە ئیعلامییە شەوو رۆژ کار بۆ بەختەوەری مرۆڤ‌و گەیاندنی پەیامی خوایی بە هەموو

سەر زەوی بكات،[1] چونكە هێزو كاریگەری وشە كە بە هۆی كەناڵی راگەیاندنەوە بەگوێی خەڵكی دا ئەدرێ، زۆرەو بەڵگەنەویستە و شوێنەوار جێدێڵێ لەسەر دڵی بیسەرو بینەردا.

٤ـ راگەیاندنێكی بوێرو شۆڕشگێڕە:

هەموو ئەو هێرش‌و پەلامارانەی ناحەزانی پەیامی ئیسلام دەیكەن‌و جۆرەها تۆمەت ئەخەنە پاڵ ئەو پەیامەو هەڵگرانی، پێویستە راگەیاندنی ئیسلامیی بەوردی و بەڵگەوە رووبەڕوویان ببێتەوەو وەڵامی زانستییانەو مەنتیقییانەیان بداتەوەو نابێ بێدەنگ بووەستێت، بەداخەوە ئەمڕۆ هەر لە نێو خودی كۆمەڵگا ئیسلامییەكاندا ـ چ جای جیهانی دەرەوە ـ راگەیاندن بەگشتی‌و رۆژنامەگەریش بەتایبەتی هەوڵی تێكدانی عەقڵی ئیسلامیی‌و لەبەریەك هەڵوەشاندن‌و سڕینەوەی ناسنامەی ئیسلامیی گەنج‌و لاوانی مسوڵمان ئەدات، وە دەیانەوێت بەهائیسلامییەكان لە دەوڵەت‌و سیاسەت جیابكەنەوەو ئیسلام بەكۆنەپەرستی‌و دواكەوتوویی‌و دەوڵەتی ئایینی **(الدولة الدينية أو الثيوقراطية)** لەقەڵەم ئەدەن، هانی ئافرەتی مسوڵمان ئەدەن بۆ دەرچوون لەشەرم‌و شكۆو داب‌و نەریتی رەسەنی كۆمەڵگای ئیسلامیی‌و گومان دروست كردن لەسەر بیروباوەڕو ژیارو مێژووی ئیسلامیی‌و بڵاوكردنەوەی بیروباوەڕی نامۆو دوور لە باوەڕی گەل‌و میللەت، وە ناوزەد كردنی ئیسلام‌و مسوڵمانان بە (وشك‌و دۆگما) و (تیرۆریست)و (توندڕەو)و (ئوصوڵی).. هتد. لەولاشەوە بانگەشە بۆ ژیارو شارستانیەتی خۆرئاواو پێشكەوتنەكانی لە بواری زانستی‌و تەكنەلۆژیا دەكرێت، بێ ئەوەی كە باس لە بوارەكانی تری ژیان‌و شارستانیەتی خۆرئاوا بكرێت وەك لە دەستدانی بەهای رەوشتی‌و رۆحی‌و بڵاوبوونەوەی چەندین نەخۆشی ترسناك لە ئاكامی ئازادی رەهاو بێبەندوباریی وەك نەخۆشی (ئایدز) كە هەڕەشە لە دوارۆژی كۆمەڵگاكانیان دەكات.

هەموو ئەوانە، پێویستە راگەیاندنی ئیسلامیی بوێرانە بەرەنگارییان بێتەوەو دژ بەم هێرش‌و پەلامارو بوختانانە بووەستێ‌و راستییەكان روون بكاتەوە بە بەڵگەی سەلمێنەر، نەك تەنیا ئیدعای رووت.[2]

---

[1] – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٧ـ ١٨.

[2] – موسى زيد الكيلاني، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢. إكرام كريم حمەأمين، لە بنەما فیكرییەكانی بزووتنەوەی یەكبوونی ئیسلامیی، لە بڵاوكراوەكانی بزووتنەوەی یەكبوونی ئیسلامیی كوردستان/ عێراق، ١٤٢١ك ـ ٢٠٠٠ز، ل ١٦٧ـ ١٦٨. (ناوی چاپخانەو ژمارەی چاپی بەسەرەوە نییە).

لەلایەکی ترەوە راگەیاندنی ئیسلامیی ئەبێ گیانی بەرخۆدانو ئازایەتی لەدڵو دەروونی جەماوەردا دروست بکاتو جۆشیان بداتو بەنەخشەو پلانی وردەوە بێتە مەیدانو میللەت وریا بکاتەوە و پەروەردەی بکاتو نەوەی نوێ بەرچاو روون بکات. وەسەروەرییەکانی مێژووی مسوڵمانان و دەسکەوتە گەورە و زێڕینەکانی حوکمڕانی ئیسلامیو گۆشەنیگای بۆ مرۆڤ و ژیان و مافی گەلان بە گشتی بخاتەڕوو، بۆ هەر رەخنەیەکیش وەڵامی دروستی پێ بێت.

**٥- راگەیاندنێکی راستگۆو دادپەروەرانەیە:**

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی راگەیاندنی ئیسلامیی دوورکەوتنەوەیە لە چەواشەکاریو سەر لە خەڵك شێواندن، بۆیە هەمیشە پابەند دەبێت بە دادپەروەریو هاوسەنگی لەگشت کاتو بارودۆخێکدا، ناچێ بەلای کەسێکی دیاریکراو، یان رەگەزو چینو توێژو نەتەوەیەك دا بیشکێنێتەوە، یان بۆ بەرژەوەندییەك بەرگری لە یەکیان بکات مادەم هەق لای ئەو نییە، چونکە ئیسلام دەیەوێت ئەو شتە پێشکەش یە جەماوەر بکاتو ئاراستەی بکات کە دووربێ لە فرتو فێڵو زیادەڕەوی (**إفراط**) یان کەمڕۆیی (**تفریط**)و لە چوارچێوەیەکی واقیعیدا بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ..**).[1] واتە: ئەی باوەڕداران بەدادپەروەریو بێ جیاوازی رابن بەکاری خەڵكو شایەتیش بۆ خودا بدەن، باوەکو شایەتیدانتان لە زیانی خۆتانو دایكو باوكو خزمانیشتان بێت.

"بەم شێوەیە، ویژدانی راگەیاندنی مسوڵمانو فەرهەنگە رەسەنەکەی و رۆحە ئەمینەکەی، دەبێتە پاڵنەرێك بۆی بۆ وتنی قسەی هەقو راستی، ئیدی فریودانو لە خشتەبردنەکان (سیاسی، ماڵی، یان فشارە کۆمەڵایەتییەکان) هەرچییەك و چۆن بن. بۆیە دەڵێین هەر چاودێریی ویژدانییە کە راگەیاندن بەسەرکەوتن دەگەیەنێ، لە کاتێکدا هەموو چەشنە چاودێرییەکی تری ئیداری و ئەنجومەنە رۆژنامەوانی و ئیعلامییەکانو لیژنەکانی بەدواداچوونی راستییەکان بێ ئاکام بوونو سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا لەو بوارەدا، چونکە لەگەڵ بوونی ئەم رێککاریو دامەزراوانەش هێشتا هەڵوێستی راگەیاندنی خۆرئاوا بەرەو باشی نەچووە کە هەنووکە هەست و غەریزەکان ئەوروژێنێتو تێوەگلاوە لە

---

[1] - (النساء: ١٣٥).

بڵاوکردنەوەی هەواڵو (فیلم و دراما)ی تاوان و توندوتیژی بە چەندەها شێوازی جۆراوجۆرو بەشێوەیەك کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی خستۆتە بەر هەڕەشەو مەترسییەوە". [1]

٦ـ پلە بەپلەیی لە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتییدا:

هەروەك لە بنەماکانی راگەیاندنی نوێ، پێڕەوکردنی قۆناغ بە قۆناغو پلەبەندی (التدرج)ە لە پرۆسەی گۆڕینی کۆمەڵایەتیو گواستنەوە لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر، ئەم پرەنسیپە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کۆمەڵگەی مەککەدا پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە لەسەری رۆیشت، چونکە لەبەرچاونەگرتنی پلەبەپلەیی لە کاری راگەیاندندا وا دەکات بەرەی ئۆپۆزیسیۆن یان بەرامبەر زیاتر بوروژێتو هانبدرێت لەبری سەرنج راکێشانی، یاخود (بێلایەن) کردنی، لەبواری هزری ئیسلامیو لەچوارچێوەی بەهاو ئاکارە بەرزەکانیدا ئەبێ هەوڵی راکێشانو نزیکخستنەوەیان بدرێت بۆ وەرگرتنی پەیام، و دەسەڵات ئەم ئەرکە ئەخاتە ئەستۆی خۆی، چونکە هەر لەو چوارچێوانەدا کارلێکی تەواو لە نێوان هاووڵاتیو پرۆسەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتیدا ئاسان دەبێت، واتە نابێ دەسەڵات خۆی دووربگرێ لە خواستو داوای هاووڵاتیان، یاخود پەرچەکرداریان و ئەبێ بەنەزەری ئیعتیبار وەریان بگیرێ. [2]

٧ـ راگەیاندنێکی راستڕەو و میانەڕەوە:

مەبەست لە مامناوەندی (**وسطي**) بوونی راگەیاندنی ئیسلامیی ئەوەیە کە هێڵی ناوەند دەگرێ لە مامەڵەکردن داو پارێزگاری لە رەسەنایەتی هزری ئیسلامیی دەکاتو کار لەسەر قەناعەت پێهێنانو بەپیرەوە هاتن دەکات بۆ راپەڕاندنی پرۆسەی نوێخوزای بەشێوازێکی بەرنامەدارو لەسەرخۆ کەوادەکات هاووڵاتی بڕوانێتە ئاسۆی داهاتوو بە کاراییو ئیجابییەتەوە لەگەڵ پارێزگاریکردن لە دابونەریتو بەها ڕەسەنەکانی کۆمەڵگا، [3] وە ئازادی

---

[1] – رعد كامل الحيالي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

[2] – موسى زيد الكيلاني، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.

[3] – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣. پێویستە لێرەدا ئاگامان لەو خاڵە بێ کە راگەیاندن کارێکە مسوڵمانان پێی هەڵدەستن، خوای گەورەش لە هەموو ئیشو کارێکدا مسوڵمانانی کردووە بە ئوممەتو نەتەوەیەکی میانەڕەو، واتە: نەزێدەڕۆن، نەکەمتەرخەمن، (وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً ...). (البقرة: ١٤٣). وەسفی راگەیاندنیش بە میانەڕەو لەو چوارچێوەیەدایە.

ئیعلامی‌و ئازادی رادەربڕین لەو چواچێوەیەدا سەیر دەكات، نەك راگەیاندن بەنێوی (دەسەڵاتی چوارەم)ەوە، ئازادی رەها بەخۆی بداتو (حەسانە)ی هەبێ و هەرچی بیەوێت بڵاوی بكاتەوە باوەكو دژیش بووەستێ لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامو دابونەریتی گشتی كۆمەڵگا، تەنها بەوەندە خۆی لێ قوتار بكات كە (ئەو راو بابەتانەی بڵاودەكرێنەوە گوزارشت لە رای نووسەرەكانیان دەكەنو رۆژنامە، یان گۆڤار لێیان بەرپرسیار نییە!)، بەڵكو ئازادی خۆی گرێدراوە بە بەرپرسیارێتی‌و لە دوو توێی یاساو رێساكانی هەر وڵاتێكیشدا چوارچێوەكانی دیاریكراون هەریەكەو بەپێی سیستمی سیاسی‌و باوەڕو كلتوری لە ئارادا بووی خۆی كە راگەیاندنیش گوزارشت لە فیكرو فەلسەفەكەی دەكاتو بەدەرنییە لێی.

## ئەركەكانی راگەیاندنی ئیسلامیی

بە كورتی دەتوانین ئەركەكانی راگەیاندنی ئیسلامیی لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا پوختە بكەینەوە:[1]

١ـ بایەخدان بە بیروباوەڕو بەها ئیسلامییەكانو دابونەریتی رەسەنو خووڕەوشتی ئیسلامیی.

٢ـ هۆشیاركردنەوەی جەماوەر لە پیلانو نەخشەی ناحەزانی ئیسلام و رووبەڕووبوونەوەو بەرپەرچدانەوەی ئەو بانگەشانەی دژ بە پەیامی ئیسلام دەكرێن و ئەو تۆمەتە ناڕەوایانەی دەدرێنە پاڵ ئەو پەیامە و مسوڵمانان بە مەبەستی چەواشەكردنیانو لەقكردنی بیروباوەڕو رەوشتیان.

٣ـ هۆشیاركردنەوەی مسوڵمانان و زانیاریدان پێیان لەمەڕ ئەو شتانەی لە دەوروبەریاندا دەگوزەرێ و پەیوەندی بە ژیانو بەرژەوەندی ئێستاو دوارۆژیانەوە هەیە، وە لێكدانەوەو شرۆڤەكردنی هەر هەواڵو نوچەو رووداوێك لە ژێر رۆشنایی فەرمانو رێنماییەكانی ئیسلامدا.

---

[1] – بڕوانە: رعد كامل الحيالي، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠ـ ٣١. رؤى في مسار العمل الاسلامي، إعداد مجموعة من الباحثين، أربيل ـ كوردستان العراق. ١٤٢٣ه ـ ٢٠٠٢م، ص٥٢٢ـ ٥٢٣. (ناوی چاپخانەو نۆرەی چاپی بەسەرەوە نییە).

٤ـ ئاڕاستەکردنی رای گشتی لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا بە پێی بنەماکانی ئیسلام کە خزمەت بە ئامانجە بەرزەکانی بکات.

٥ـ بەیەکەوە گرێدانی جیهانی ئیسلامیی و یەکخستنی وتەو هەڵوێستی مسوڵمانانو تەقەللاکانیان.

٦ـ فەرمان بە چاکەو چاکەخوازیو بەرهەڵستی کردن لە خراپەو خراپەکاری و گەندەڵی، و راگەیاندن و خەڵك تێگەیاندن بە دانایی و ئامۆژگاری جوانو وتووێژو دیالۆگ کردن بە جوانترین رێگەو شێواز وەك قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات.

٧ـ ئاگادارکردنەوەی مسوڵمانان لەو مەترسییانەی رووبەڕوویان دەبنەوەو دەرخستنیان تاوەکو خۆیانی لیٚ بپارێزن یان بە ئاگایانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن.

٨ـ ناساندنی کێشەو پرسەکانی جیهانی ئیسلامیی وەك کێشەی گەلی کوردو کێشەی گەلی فەلەستینو گەلانی تری مسوڵمان کەساڵەهایە ستەمیان لێدەکرێتو لە مافەکانیان بێبەش دەکرێن، تێگەیاندنی رای گشتی جیهانی و قەناعەت پێهێنانی بە رەوایيو گرنگی ئەو کێشانە.

٩ـ گرنگیدان و روونکردنەوەی پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤو رێزو کەرامەتی ئینسان لە روانگەی ئیسلامەوە.

١٠ـ رێنمایی کردنی رابوونی ئیسلامیی تا ڕەوتێکی راستو دروست بگرێتە بەر، وە پشتگیریی کردنی هێزو رەوتو بزاڤە ئیسلامییەکان لە جیهادو خەباتیاندا دژ بە ستەمو زۆرداریو خزمەتکردنی گەلانی مسوڵماندا.

١١ـ دەرخستنی رۆڵی سەرکردەو بزاڤە ئیسلامییەکان لە گشت بوارەکانداو پشتگیریی کردنی بانگخوازو سەرکردە پێشەنگەکان ئەوانەی (عیلم)و (عمل)یان پێکەوە کۆکردۆتەوەو پابەندی خۆیان بە بەهاو رەفتارو ئاکاری ئیسلامیی سەلماندووە.

١٢ـ بایەخدان بە ڕووداوو مەسەلەکان بە پێی ئەولەویەتو گرنگییان.

١٣ـ چاندنی هیواو ئومێد لە دڵی خەڵکی داو سوککردنی باری ژیانو گرفتە کۆمەڵایەتیو دەروونییەکانی ئەم چەرخە کە مرۆڤ لەگەڵیان دەستەویەخەیەو بەرپەرچدانەوەو رووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەو هەواڵو توێژینەوەو دەنگۆیانەی بیٚ هیواییو دەستەپاچەییو تێشکانو باوەڕ بەخۆنەبوون لەنێو دەروونی مسوڵماناندا بڵاودەکەنەوە.

١٤ـ خێرایی لە گەیاندنی هەواڵو بێلایەنی لەبڵاوکردنەوەیدا.

١٥ـ دوورکەوتنەوە لە بڵاوکردنەوەو پەخشی هەر هەواڵو دەنگوباسێك کە زیان بە مسوڵمانانو کۆمەڵگەی ئیسلامیی بگەیەنێ، یان ناحەزانیان سوودی لێوەربگرن وەك ئەو فیلمو وێنەو بەرنامانەی کە نەشیاون بە کۆمەڵگەی ئیسلامییو شەرعی ئیسلام پەسەندیان ناکات، لە بەرامبەردا گواستنەوەی هەر هەواڵو نوچەیەك لە جیهانی دەرەوە یان لە ناحەزانی ئیسلامەوە کە سوودێك بە مسوڵمانانو رۆشنبیرییان بگەیەنێت.

١٦ـ دوورکەوتنەوە لەو شتانەی فیتنەو ئاژاوەو دووبەرەکی لەنێو مسوڵماناندا دەنێتەوە، هەروا لەو شتانەی تۆمەت و قسەی ناشایستەی تێدایە بۆ مسوڵمانان.

١٧ـ لەیەکتر نزیکخستنەوەی راوبۆچوونەکان و کارکردن بە ئاراستەی نەهێشتنی جیاوازی و ناکۆکییەکان لە نێوان مسوڵمانانو سەرکردەو تەوژمەکانیانو قوولکردنەوەی گیانی برایەتی ئیسلامیی لە نێوانیاندا (**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ**)،[1] واتە: بێگومان هەر باوەڕداران برای یەکن، جا براکانتان ئاشت بکەنەوە و ئاشتەوایی بخەنە نێوانیان، وەلە خوابترسن بەشکو خوا بەزەیی بێتەوە پێتاندا.

١٨ـ بیناکردنی کەسایەتی مسوڵمان لەسەر بنەمای رێنماییەکانی ئیسلامو پەروەردەو تێگەیاندنو پێگەیاندنی بەشێوەیەکی زانستیو بابەتیانەی هاوچەرخ.

١٩ـ پێکەوەگرێدانی رەسەنایەتیو نوێخوازی لەبەکارهێنانی هۆکانی راگەیاندنی هاوچەرخ لە (تەلەفزیۆن، رادیۆ، رۆژنامە، گۆڤار، بڵاوکراوەکان، کەناڵی ئاسمانیو ئینتەرنێت... تاد)، لەگەڵ پارێزگاریکردن لە بنچینە و بنەما نەگۆڕەکانی شەرعی ئیسلام.

٢٠ـ پێگەیاندنی کادیری پسپۆڕ لە هەموو بوارەکانداو ئاسانکاری لە تێگەیشتنی ئیعلامیدا لە گشت قۆناغەکان (بەرنامەی کۆمەڵایەتی، مناڵان، لاوان، سەرگەرمی و تەرفیهی، بەرنامە تایبەتمەندەکانی بوارەکانی تر، و گشتی..).

٢١ـ پێشکەشکردنی ئەلتەرناتیڤ (بديل)ی ئیسلامیی لەبەرنامەکانی راگەیاندندا کە پشت بە بنەمای زانستیو بەڵگەی روون ببەستێو بەرنامەو پرۆگرامەکانیش گشت بوارەکانی فیکریو سیاسیو بانگەوازو پەروەردەو کۆمەڵایەتیو خزمەتگوزاریو لاوان و ئافرەتان و وەرزشو .. تاد لە خۆبگرێت.

---

[1] - (الحجرات: ١٠).

٢٢ـ پرۆتستۆ (إدانه) کردنی هەر جۆرە رەفتارو هەڵسوکەوتێك لە بواری راگەیاندندا کە دووربێ لە ئادابی گشتی کۆمەڵگەی ئیسلامییو پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام بێت، وە دەرخستنو روونکردنەوەی ئاکامە ترسناكو نێگەتیڤەکانی بۆ کۆمەڵانی خەڵك بە بەڵگەی بەهێزو زانستیانە.

٢٣ـ کارکردن بۆ گەیشتن بە گوتارێکی راگەیاندنی سیاسی ئیسلامیی جیهانی، لانی کەم بۆ ئەمڕۆی مسوڵمانان، لەسەر ئاستی هەر ناوچەو وڵاتێکی ئیسلامییدا، یاخود لە دەرەوە لەسەر ئاستی هەر وڵاتێك کە رەوەندی ئیسلامی کاری راگەیاندنی ئیسلامیی تیادا ئەنجام دەدات.

## بنەما شەرعییەکانی کاری رۆژنامەوان و پەیامنێر

پێویستە لەسەر پەیامنێرو رۆژنامەوانی مسوڵمان رەچاوی ئەو بنەماو مەرجو رێککارییە شەرعییانە بکات کە پێتڤیە لەبواری راگەیاندندا پێیانەوە پابەند بێت، کە ئێمە لە چەند خاڵێکدا پوختیان دەکەینەوە:

**یەکەم: دڵنیابوون لە راستی هەواڵ:**

پێویستە لەسەر پەیامنێر و رۆژنامەڤانی مسوڵمان کە قووڵبوونەوە بکات لە هەر هەواڵێك کە دەیگوازێتەوەو بە وردی بکۆڵێتەوە لە هەڵبژاردنی ئەو سەرچاوە هەواڵدەرییانەی هەواڵەکەیان لێ دەگوازێتەوە بۆ دڵنیابوون لە راستیو دروستیەکەی، بۆیە قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات بە بڕواداران گوێ نەدەن بە پڕوپاگەندەو دڵنیابن لە هەواڵو دەنگوباس، نەخاسمە گەر هەواڵەکە لە کەسێکی نادادپەروەر یاخود گومانلێکراو یان تۆمەتبار دەرچوویێت (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ**).[١] واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! ئەگەر کەسێکی لە فەرمان دەرچوو ـ نادادپەروەرو متمانەپێنەکراو ـ هەواڵێك لە هەواڵەکانی بۆ هێنان، بە وردی لەراستیو دروستی وردبنەوە، نەکا گەلێك تووشی زیان بکەن لە کاتێکا ئێوە راستی مەسەلەکە نازانن و پاشان لە کارەکەتان پەشیمان بن.

---

[1] – (الحجرات: ٦).

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ: (**لا تجوز شهادة خائن ولا خائنة ولا ذي غمر على أخيه**).[1] واتە: شایەتی هیچ خیانەتکارێکی ژن یان پیاو و قین لەدڵ لەسەر براکەی دروست نییەو وەرناگیرێت.

کەوابوو نابێ هەر هەواڵێکی گوێبیستی بوو، یان کاسێتێك یا وێنەو ریپۆرتاژێك لە ئاژانسێکی دەنگوباس، یان کەناڵێکی راگەیاندن دەستی دەکەوێت، کتومت وەریبگرێتو بڵاوی بکاتەوە بە نێو جەماوەردا، بێئەوەی لەسەرچاوەکەی بکۆڵێتەوە ئاخۆ جێی دڵنیاییو متمانەیە یان نا؟ یاخود بە چ نیازو مەبەستێك هەواڵەکە دارێژراوە، چونکە زۆرجار رێکەوتووە گواستنەوەی هەواڵێك، یان وشەیەك، قسەیەك، لەلایەن کەسێکی باوەڕپێنەکراوەوە کارەساتێکی ناوەتەوەو بۆتە هۆی نانەوەی شەڕو هەراو پەرتەوازەییو دووبەرەکی لەناو کۆمەڵگادا.

هۆی دابەزینی ئایەتی سەرەوەش لە سورەتی حوجورات ئەوەبووە کە گێڕدراوەتەوە پێغەمبەر (ﷺ) (وەلیدی کوڕی عوقبە) بۆ لای حاریسی کوڕی ضیرار رەوانە دەکات، بۆ ئەوەی ئەو زەکاتەی لە گەلەکەی کۆکردۆتەوە لێی وەرگرێ، بەڵام کاتێك وەلید رۆیشت و لێیان نزیك بوویەوە، ترسو لەرز دای گرتو نەیوێرا بچێتە ناویان، بۆیە گەڕایەوە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێی وت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)! ئەوان پاشگەزبوونەتەوەو زەکات نادەن، ئەمەش وای لە هەندێ لە یارانی پێغەمبەر کرد کە بیر لەوە بکەنەوە دەربچنو بەگژیاندا بچنەوەو بیکەن بە شەڕ لەگەڵیاندا، ئیتر ئایەتەکە دابەزی کە نەکەن بە گژ ئەو گەلەدا بچن بێ ئەوەی لە راستی ئەو هەواڵە ورد بنەوە.[2]

**دووەم: راستگۆییو ئەمانەت لە گواستنەوەی هەواڵدا:**

پاش ئەوەی رۆژنامەوان لە راستیو دروستی هەواڵەکەی کۆڵییەوەو وردبوویەوە، دەبێ خۆیشی پابەندبێت بە راستیو راستگۆیی، واتە کاتێ هەواڵەکە بۆ دەزگایەکی راگەیاندن (رۆژنامە، گۆڤار، تەلەفزیۆن، رادیۆ، کەناڵی ئاسمانی، ئینتەرنێت..) دەگوازێتەوە، دەبێ وەك خۆی چۆن دەستی کەوتووە یان بینیویەتی ئاوا نەقڵی بکات، چونکە هەر هەوڵدانێك بۆ

[1] – ئەبوداود گێڕاویەتییەوە، بڕوانە: رعد كامل الحيالي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤.

[2] – محمد علي الصابوني: صفوة التفاسير، دار القرآن الكريم، ج٣، بيروت، تفسير سورة الحجرات، ص٢٣١. (مێژووو نۆرەی چاپی لەسەر نییە).

شاردنەوەی بەشێکی هەواڵ یان زیادکردنی شتێك کە روونەداوەو بەشێك نەبووە لە هەواڵەکە، دەچێتە چوارچێوەی ناڕاستگۆیی و (درۆ)وە، کە ئەمە پێی دەوترێت پرۆسەی دابەشکردن یان (**توظيف الأخبار**)، بەڵام لەراستیدا ئەمە پۆلێنکردنی هەواڵ نییە، بەڵکو پرۆسەی تێکەڵکردنی راستییە لەگەڵ درۆو ئەوەی روویداوە لەگەڵ ئەوەی هەر نەبووەو روونەداوە،[1] خوای گەورە دەفەرموێت: (**وَلاَ تَلْبِسُواْ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُواْ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ**).[2] واتە: راستی رەوا تێکەڵ بە ناڕەوا مەکەن و دامەپۆشن، حاشا لەو راستییە مەکەن کە بۆ خۆتان دەیزانن‌و ناسیوتانە.

راستگۆیی لە هەموو حاڵەتێکدا ئەبێ ئیلتیزامی پێوە بکرێت، وە نابێ بەناوی پێشبڕکێی رۆژنامەوانی (السبق الصحفی)و لە پێناو ناووناوبانگ، ئەو فەرمانە خواییە پشتگوێ بخرێ (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ**).[3] واتە: ئەی باوەڕداران لە خوا بترسن‌و لەگەڵ گرۆی راستاندا بژین. پێغەمبەریش (ﷺ) ئامۆژگاری کردووین بە راستی‌و راستگۆیی (**دع مايريبك الى مالا يريبك، فان الصدق طمأنينة والكذب ريبة**).[4] واتە: واز لە شتێك بێنە کە دەتخاتە گومانەوەو شکت هەیە لە حەلاڵ بوونی داو برۆ بۆ ئەوەی گومانت تیانییە، چونکە راستگۆیی دڵنیایی‌و ئۆقرەییەو درۆو ناڕاستیش گومان‌و دڵەڕاوکێییە.

ئەڵبەتە پێشبڕکێی رۆژنامەوانی، مافێکی سروشتی بەدەستهاتووە لە میانەی مونافەسەی شەریفانە لە نێوان دەزگاو کەناڵەکانی راگەیاندندا بۆ هەرچی خێراتر ئاگادارکردن‌و زانیاری دان بە (وەرگر) لەمەڕ نوێترین و دواهەمین دەنگوباس، بەڵام چونکە راستگۆیی لە گرنگترین رەگەزەکانی (هەواڵ)ە گەر ئەم رەگەزە یان توخمەی لە دەستدا، نەك تەنیا حەقیقەتی واقیعی خۆی لەدەست ئەدات، بەڵکو دەبێتە هۆکارێکیش بۆ

---

1 – **رعد كامل الحيالي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥.**

2 - (البقرة: ٤٢ ).

3 - (التوبة: ١١٩ ).

4 - تیرمذی گێڕاویەتییەوە و دەڵێ فەرموودەیەکی راستە، بڕوانە: رياض الصالحين، الإمام النووي، تحقيق عبدالله أحمد أبوزينة، مكتبة النهضة العربية، باب الصدق، ص٣٩.

سەرلێشێواندنی (وەرگر)و خستنیە ناو کەندەڵانی قووڵو فراوان، بەشێوەیەك کە روانگەی بۆ شتەکان تێك دەداتو گەنجینەی ئاگاییەکەی پڕ لە شتی هەڵەو پەڵەو دژ بەیەك دەکات.[1]

بۆیە لەگەڵ پێشکەوتنو زیادبوونی هۆکانی راگەیاندنو پێشکەوتنی زانستی و شۆڕشی تەکنەلۆژیاو گەیاندندا، کێبەرکێی نێوان کەناڵەکانو مونافەسە ئیعلامییەکە (زۆرجار) بۆتە هۆی شێواندنی (هەواڵ)و گومڕاکردنی وەرگر، یان وەك بڵێی هەواڵەکە خۆی ئامانج بێت نەك هۆکارێك بێت بۆ هۆشیاری جەماوەرو سەرەنجام میسداقیەتی خۆی لە دەست دەدات.[2]

**سێیەم: رەچاوکردنی پێکهاتەو باری کۆمەڵگا:**

بەسەرنجدان لەوە کە رۆژنامەوان یان پەیامنێری مسوڵمان لەو کۆمەڵگایەدا دەژی کە هەواڵەکەی لێوە پەخش دەکات یان دەنێرێ، پێویستە رەچاوی بارودۆخی ئەو کۆمەڵگایەو پێکهاتەکانی بکات، ئەمەش بە نەوروژاندنی ئەو پرسو بابەتانەی وروژێنەرو جێی مشتومڕن یاخود کێشەو گرفتی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئایینی...، دەنێنەوە، وە بەکارنەهێنانی وشەی زامدارکەر و جنێوو نەفرەتو درۆو هەڵخەڵەتاندنو بەکەم سەیرنەکردنی بەرامبەرو رێزگرتن لە مافی هاووڵاتیان بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە بەپێی رێنماییەکانی ئیسلامو پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤی ئیسلامیی، یەکێکیش لە رەوشتە جوانەکانی مرۆڤی مسوڵمان خۆ تێهەڵنەقورتاندنە لە کارێك کە پەیوەندی بەخۆیەوە نییە، بۆیە هەرچی کارێك شەرعی پیرۆز بەناپەسەندی زانیبێ وەك روشاندنی سومعەو ناوبانگی خەڵك، یان پەیوەندی بەکاروباری تایبەتی ناوخێزانەوە هەبێت، دەبێ خۆی لێ بپارێزێ.

**چوارەم: دەستخستنی هەواڵ بە رێگای شەرعی:**

هەروەك نابێ رۆژنامەوان و پەیامنێر کارێك ئەنجام بدات پەیوەندیداربێ بە ئیشەکەی خۆی کە پەیامی پیرۆزی ئیسلام قەدەغەی کردبێ، یان کە پەیوەندی بەمەوەو کارەکەیەوە نەبێت، وەك لە خاڵی سێیەمدا ئاماژەمان پێدا، ئاوەهاش دەبێ هەر هەواڵێك دەستی دەخات بەرێگای دروستو شەرعی بێت، واتە وەسیلەکان مەشروع بن، بۆ نموونە نابێ لە رێگەی گوێ هەڵخستن یان جاسوسییەوە هەواڵ دەست بخات، خودا دەفەرموێت: (ولا

---

[1] - خالد بكر أيوب: الاعلام بين المصداقية والسبق الصحفي، الصحفي تصدرها نقابة صحفي كوردستان، العدد (١٥)، ١ شباط ٢٠٠٦، ص٣.

[2] - أحمد إبراهيم الورتي: مصداقية الصحافة ، الصحفي، العدد (١٧), ١ نيسان ٢٠٠٦، ص٨.

تجسسوا...)[1] واتە: مەگەڕێن بەدوای نهێنی و ئابڕووی مسولمانانداو سیخوڕییان بەسەرەوە مەکەنو بەشوێن شتێکدا مەگەڕێن کە لەکەداریان بکات.[2]

هەروەك نابێ هەواڵی خەڵك بەدەست بێنێ لە ڕێگەی دزینو نائاگاییو بێڕەزامەندی و ئاگاداری خۆیان، وەك ئەوەی پێی دەوترێت کامێرای شاراوە، یاخود ئاگاداربوون لە هەندێ بەڵگەنامەو زانیاری بێ ئاگاداری خاوەنەکەی، هەروەها ئەو هەواڵو زانیارییانەی کە ڕۆژنامەوانو پەیامنێر بەشێوازی بەرتیل وەرگرتن دەستیان دەخات کە ئەمڕۆ بە زۆری لەژێر ناوی (خەڵاتو موکافەئە)دا پێشکەش دەکرێت، یاخود ئەو خۆی بەرتیل ئەدا بە خەڵکانی تر بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە دەستی بە هەواڵو دەنگوباس رابگات ئیتر راست دەربچن یان نا **(لعن الله الراشي والمرتشي والرائيش بينهما)**،[3] واتە: خوا نەفرینی لەو کەسە کردووە بەرتیل ئەداو ئەوەشی وەریدەگرێتو لەوەش کە کاری بەرتیل دانەکە ئاسان دەکات و واسیتە لەنێوانیاندا.

**پێنجەم: ڕەچاوکردنی ئادابی ئیسلامیو بڵاونەکردنەوەی هەواڵی زیانبەخش بۆ کۆمەڵگا:**

ئەو هەواڵو راپۆرتو دەنگوباسانەی ئامانجیان روشاندنی ناوبانگی مسولمانانو بانگخوازانو بوختان و تۆمەت بۆ هەڵبەستنیانە بە مەبەستی لەکەدارکردنی کەسایەتییانو لەقکردنی پێگەی کۆمەڵایەتییان، یان ئەوانەی بانگەشەی کلتورو ئادابی دوور لە ئادابی ئیسلامی دەکەنو خراپەو بێبەندو باری لەکۆمەڵگادا بڵاودەکەنەوە، دەبێ پارێزی لێ بکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: **(إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ)**[4]. واتە: ئەوانەی دەیانەوێت بەدکاری و بێبەندو باریو کاری قێزەونو وتەی ناشیرینو تۆمەتی خراپ بڵاوبکەنەوەو بیلکێنن بە بڕوادارانەوە، ئەوانە سزایەکی سەختو دەردناکیان بۆ هەیە لە دنیاو دوارۆژدا.

هەر لە ڕەچاوکردنی ئادابو رەوشتی ئیسلامیی و پەخش نەکردنی شتی زیانبەخشە بۆ کۆمەڵگای مسولمان، خۆپاراستن لە بڵاوکردنەوەی ئەو فیلمو وێنەو زنجیرە دراما

---

[1] – سورەتی (حوجورات) ئایەتی (١٢).

[2] – محمد علی الصابونی: سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ل٢٣٥.

[3] – طەبەرانی گێڕاویەتییەوە، بڕوانە، رعد كامل الحيالي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

[4] – سورەتی (نور) ئایەتی: (١٩).

تەلەفزیۆنیانەی بەرهەمهێنراون و دوورن لە ئادابی ئیسلامیی وەك خۆدەرخستنی ئافرەت بەرووتیو بەشێوەیەکی شەرم ئاوەر، یان ئەوانەی بێ بەندوباریو توندوتیژی و دەرچوون لە بەهاو دابو نەریتی خێزانو کۆمەڵ لەنێو کۆمەڵگادا بڵاودەکەنەوە کە بەداخەوە ئەمڕۆ لە بازاڕو ئینتەرنێتو کەناڵە ئاسمانییەکاندا، بە بەرفراوانی وەك دیاردەیەکی زەق دەبینرێن.

**شەشەم: پشت بەستن بە بەڵگە، نەك سۆزو عاتیفە:**

ڕۆژنامەوان نابێ هەواڵی بێ بنەماو بێ بەڵگە بڵاوبکاتەوە، چونکە ئەوکاتە ڕاستگۆیی خۆی لەدەست دەداتو تووشی سزای یاساییش دەبێت، ئەگەر هەواڵێك لەسەرچاوەیەکەوە بیسترا یان وەرگیرا دەبێ وردبوونەوە بکرێ لە ڕاستیو دروستی و ڕادەی نزیکبوونی لەواقیع هەروەك لە خاڵی یەکەمدا ڕوونمان کردەوە، هەروا گەر کەسێك ئیدیعای کردو هەواڵی ئەوەی بڵاوکردەوە کە فلان کەس کارێکی ئاوای ئەنجام داوە ئیتر دوژمن ناحەزی بێت یان نزیکی خۆی بێت، داوای بەڵگەی لێدەکرێت، بە داخەوە لەم سەردەمەدا زۆر جار کەسانی بێتاوان بەتایبەت ژنان ڕووبەڕووی تۆمەتی ناڕەوا بوونەتەوە بێ بەڵگەو دەلیلی ڕۆشنو شەرعی کە ئاکامی خراپی (وەك: کوشتن، لێدان، سوتان...)ی بەدواوە بووە، (ئیبن عەباس) دەگێڕێتەوە کە (هیلالی کوڕی ئومەییە)، تۆمەتی زینای خستە پاڵ ژنەکەی خۆی کە لەگەڵ پیاوێکا ئەنجامی داوە و لای پێغەمبەر (ﷺ) باسی کرد، ئەویش فەرمووی: **(البينةُ أو حدّ في ظَهرك)** یان ئەبێ شایەت بێنی یان ڕوبەڕووی شەلاق دەبیتەوە، بۆیە ئایەتی (٤)ی سورەتی (النور) دابەزی[1]: **(وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)**. واتە: ئەو کەسانەش کە بوختانێ بۆ ژنی پاك داوێن دەکەن، چوار شایەتیش ناهێنن، هەشتا شەلاقیان لێ بدەن، هەرگیز نابێ بەشایەتیان قبوڵ بکەن، ئەوانەن کە لە ڕێی خودا لایانداوە.[2]

بۆیە گرنگە بە گشتی پەیامنێری کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوان پشت بە بەڵگەی ڕوونو بێ پێچو پەنا ببەستێت دوور لە سۆزو عاتیفەو بانگەشەو ئیدیعای سەرپێ ییو لام سەلایی.

---

[1] – محمد علی الصابونی: سەرچاوەی پێشوو، ج٢، ل ٣٢٥ـ ٣٢٦.

[2] – تەفسیری مامۆستا هەژار، تەفسیری سورەتی (نور)، ل٣٥٤.

**حەوتەم: لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی مسوڵمانان:**

لەهەر هەواڵو دەنگوباسێکدا کە ڕۆژنامەوان دەیگوازێتەوە و بڵاوی دەکاتەوە دەبێ، بەرژەوەندی باڵای مسوڵمانان ڕەچاو بکات بەشێوەیەك خزمەت بە ئامانجە کانیان بکات و پێچەوانەی قازانجو بەرژەوەندی ئێستاو داهاتوویان نەبێت، ئەمەش ئەمانەتێکەو مافێکە هەر مسوڵمانێك لەسەر ئەوی تری هەیە کە (مافی برایەتی بەجێ بگەیەنێو ستەمی لێنەکات، چونکە هەرکەس ئاتاجی و پێداویستی براکەی جێبەجێ بکات خوا ئاتاجی ئەو جێبەجێ دەکاتو هەرکەس ناڕەحەتییەك لە ناڕەحەتیو سەختیەکانی مسوڵمانێك لابەرێت، خوا بە هۆیەوە یەك لە سەختیەکانی دواڕۆژی لەسەر لادەبات، وە هەرکەسێك لەکەو عەیبی مسوڵمانێك داپۆشێ، خوا لە ڕۆژی دواییدا دایئەپۆشێت).[1]

**هەشتەم: جگە لەوەی رابرد، دەبێ زمانپاراوو ڕاشکاو بێو تێگەیشتنی واقیعی کۆمەڵگای هەبێ (فهم الواقع)، ڕۆشنو بەدیقەت بێو خۆی لە گومان و شتی ئەفسانەییو خەیاڵی و خورافات و دوور لە عەقڵو شەرع بپارێزێ** وەك کەلو (بورج)ەکانو فاڵچییەتیو یاریکردن بە هەستو نەستو ئەقڵی مرۆڤەکان، تەنیا بە دوای هەڵە و کەموکوڕییەکاندا نەگەڕێ، زێتر لایەنی باشو ئیجابی و دەسکەوتو خزمەتەکان دەربخاتو لە ڕووپاماییو ماستاو چێتی و هەلپەرستی بەتوندی خۆی دووربگرێ.

جگە لەمانە، پێویستە بابای ڕاگەیاندنکار ئەم خەسڵەتانەشی تێدابێ:

- پێویستە شارەزایی پیشەیی لە بواری ڕاگەیاندنو پەیوەندیکردن بە جەماوەرو توانای مامەڵەکردن لەگەڵیاندا هەبێ.

- پاشخانێکی ڕۆشنبیری فراوانی هەبێ بۆ ئەوەی لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی هەر پێشهاتو هەڵوێستێکی ناهەمواردا پشتی پێببەستێو متمانەی بە خۆی هەبێو بتوانێ هەر شتێکی نوێ لەبواری کارەکەی خۆیدا لەخۆبگرێت.

- بتوانێ خۆی لەگەڵ جەماوەردا بگونجێنێ بەپێی ئاستی ڕۆشنبیریو فیکریو کۆمەڵایەتی چینو توێژەکانی کۆمەڵگەو ڕەچاوکردنی لە کاتی پێشکەشکردنی پرۆگرامو بابەتە ئیعلامییەکاندا.

---

[1] – واتای فەرمودەیەکی پێغەمبەرە (ﷺ) کە بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە.

ـ خودان لێکۆڵینەوەو ئەزموونێکی باش بێ لەبواری ڕاگەیاندنو هونەرە ڕۆژنامەوانییەکانو یاساو ڕێسا ئیعلامییەکان، لانی کەم گەر بڕوانامەشی نەبێ لە ئاستێکی نزیك لەوەدابێ کە لە کۆلیژەکانی ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیانندا دەخوێندرێ و بە قوتابییەکان ئەوترێتەوە.

ـ لەگەڵ بابەتیبوون لە کارەکەیدا، پێویستە خۆڕاگرو پشوو درێژو لێبوردە بێ، هۆگربێ بە کارەکەیەوەو لای خۆشەویست بێ، تەنیا بۆ موچەو موکافەئەیەك نەبێ کە کاری ڕاگەیاندن بکاتو بەس.

ـ توانای پەیداکردنی دۆستو هاوڕێی لە هەموو بوارەکاندا ببێ کە وەك سەرچاوەی پەیداکردنی زانیارییەکان پشتیان پێ ببەستێو سوودیان لێوەربگرێ، بەڵام دەبێ ئەم کارەی لەسەر حیسابی کارەکەی، یان ئەو دەزگا ڕاگەیاندنەی نەبێ کە کاری تێدا دەکاتو لە ئاستی بەرپرسیارێتی ئەخلاقی خۆیدا بێو لێی دەرنەچێ.

ـ خەسڵەتو ڕەوشتی نیشتمانپەروەری و خۆشەویستی نەتەوەکەی خۆی تێدابێ، بەتایبەتیش ئەگەر لە دەزگای ڕاگەیاندنی حکومەتدا کاری کرد (بەشێوەیەکی زەقتر)، لەهەموو حاڵەتێکیشدا دەبێ پابەندی خۆی بە پەیامو باوەڕی ئایینی خۆی بپارێزێو شانازی پێوە بکات.[1]

## وتاربێژیی و وتاری هەینی

### یەکەم: وتاربێژیی:

وتاربێژیی چەشنێکە لە چەشنەکانی ڕاگەیاندن و فاکتەر و وەسیلەیەکی کاریگەرە لە کۆمەڵگادا, پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوودی لەم هۆکارە وەك شێوازێکی ڕاگەیاندن و تێگەیاندنی خەڵك لە پەیامی خوا وەرگرتووە. لە سەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا, وتاربێژی و بەتایبەتیش شیعر وەك پیشە و هۆکارێك سوودی لێ وەردەگیرا بۆ شانازی کردن بە خۆ و شکاندنی بەرامبەر و هاندانی وروژاندنی پەلاماردان و بە گژدا چوون و تێکدان....،

[1] ـ بۆ زیاتر بڕوانە: إبراهيم إسماعيل، الإعلام الاسلامي ووسائل الاتصال الحديثة، دعوة الحق (كتاب شهري يصدر عن رابطة العالم الاسلامي)، السنة (١٣)، العدد (١٣٣)، مكة المكرمة، محرم ١٤١٤هـ ـ ص٤٢ـ ٤٩.

بەڵام کە ئایینی ئیسلام هات ئەو ڕاگەیاندنەی گۆڕی و وەك هۆکارێکی کاریگەر بۆ پەیوەندی کردن بە جەماوەر و گەیاندنی پەیامی خوا بە خەڵکی ڕێکی خست, ئەوە بوو یەکەم جار کە خوا فەرمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) کرد دەست بکات بە هۆشیار کردنەوەی گەلەکەی و لە خزمەکانیەوە دەست پێبکات (وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ)،[1] ئیتر دەستی بە وتاردان کرد و شوێنێکی گونجاویشی بۆ هەڵبژارد کە سەر گردی (سەفا) بوو و خزم و کەس و کاری بانگ کرد و پەیامی نوێی خوایی پێ ڕاگەیاندن و هۆشداری پێدان گەر قبوڵی نەکەن, ئەمەی لە شاری مەککەی پیرۆز دەست پێکرد و دوای کۆچی بۆ مەدینەش ,بەردەوام بوو لە سەر کاری وتاربێژی و بەپێی پێویست وتاری بۆ خەڵکی ئەدا بۆ فێر کردنیان و پەیام تێگەیاندنیان, وە لە بۆنەکاندا وەك ڕۆژی هەینی و هەردوو جەژنەکە (قوربان و ڕەمەزان) و لە ڕۆژی عەرەفە... وتاری بۆ ئەدان و دەچووە سەرمینبەر و ئەوەی پێویست بوایە بۆ ئەو ڕۆژی مسوڵمانان و کۆمەڵگاکەیان دەی خستە ڕوو.

دوای خۆیشی, جێنشینەکانی پێغەمبەر (ﷺ), بە هەمان شێوە وتاریان بۆ خەڵکی ئەدا چ لە ڕۆژی هەینی بووبێ یان لە جەژنەکان و کاتەکانی تر, وە سەرکردە مسوڵمانەکان کە بۆ ناوچە و وڵاتان ئەنێردران, و سەرکردەکانی جەنگ و فەرماندەکان لە جیهاد و فەتحی وڵاتەکاندا, وتاری کاریگەر و پڕ سوود و حەماسییان بۆ خەڵك ئەدا, ئەو وتارانە کاریگەری زۆریان هەبووە بە درێژایی مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان و ڕۆڵی خۆیان لە ئاڕاستە کردنی دەسەڵاتداران و هاووڵاتیاندا بینیوە, لێرەدا ئاماژە بە کاریگەری وتارەکەی (ئەبوبەکری سدیق) دەکەین کە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەر مینبەر بۆ خەڵکی دا و هێوری کردنەوە و ورە و خۆڕاگری پێدان.

هەروەها وتارەکەی سەرکردە (**طارقی بن زیاد**) لە مێژوودا مەشوورە کە چەندە کاریگەر بوو چ لە ڕووی دەستەواژە و چ لە ڕووی ئیمانی و ئاکاری بەرزی و ڕەوانبێژیەکەی ئەمەش کاتێك چوو بۆ ڕزگار کردنی ئەندەلوس, بۆیە دبێژین وتاربێژی گەر بە شێوەیەکی ڕێك و زانستی و هونەری بە کارهێنرا, ئاکامی باش و ئیجابی لێ دەکەوێتەوە و ڕۆڵی خۆی لە

[1] - (الشعراء : ٢١٤ ).

کۆمەڵگادا دەبینیٚ, هەموو ڕەوتەکان بە درێژایی مێژوو وتاربێژییان بە کارهێناوە و سوودیان لیٚ وەرگرتووە, وەك دەڵێن (ئەرستۆ)ش کتێبێکی تایبەتی لە سەر نووسیوە.[1]

**دووەم: وتاری هەینی:**

ئەگەر وتاربێژیی بە گشتی گرنگی خۆی هەبێت , ئەوا وتاری هەینی بە تایبەت بایەخێکی تایبەتی هەیە و وەك سەکۆیەکی ڕاگەیاندنی پەیامی ئیسلام و هۆشیاری کۆمەڵایەتی کاریگەری خۆی هەیە و ڕۆڵ دەبینیٚ هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و یارانی جیٚ نیشنی و دەسەڵاتی ئیسلامی بە درێژایی مێژوو, وتاری هەینی گرنگی و بایەخی تایبەتی هەبووە, سوڕەتێکی قورئانیش بە ناوی (جومعە ـ هەینی) ناوبراوە کەتیایدا خوای گەورە بانگ لە بڕواداران دەکات کاتێك گوێیان لە بانگی نوێژی هەینی بوو, بڕۆن بەرەو گوێگرتن لە وتاری هەینی و نوێژ کردن و واز لە هەرجۆرە کڕین و فرۆشتن و بازرگانییەك بێنن... (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ**).[2]

بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمرۆدا, وتاری هەینی گەرچی لە زۆر شارو وڵات و زۆر مزگەوتا ڕۆڵی خۆی وەك بە جێگەیاندنی پەیامی ئایینی و کۆمەڵایەتی... دەبینیٚ, وەلیٚ چونکە وتاردان هونەرێکە هەموو کەس نایزانیٚ و کەمتر نیشانەی وتاری سەرکەوتوو لە زۆربەی وتارەکانی هەینی ئێستادا بەدی دەکریٚ, بۆیە ڕۆڵی کەم بۆتەوە لە کۆمەڵگادا و کارناکاتە سەر گوێگرانی, هەندیٚ وتار هەیە زۆر درێژە, هەندێکی تر نازانستی و ئاست نزمە, یان زۆر زانستیە گوێگر تێی ناگات, هەندێکی دیکەیان نووسراونەتەوە و هەمیشە دووبارە دەکرێنەوە لە لایەن وتاربێژ (**خطیب**)ەوە یان خۆی بۆ ئامادەناکات, یان حەماس و هەڵچوونی لە ڕادەبەدەر زاڵ دەبیٚ بە سەریدا, هەندێکی دیکەش لە وتارەکانی هەینی بابەتی نین یا خود گیروگرفت و کێشە و ئاریشەکانی خەڵکی ناخەنە بەرباس و خواس و بابەتەکان دوور لە واقیع و مردوون, لەگەڵ ئەمانەشدا ئەوەی کە مەترسی دارە ئەو وتارانەن کە بۆ

---

[1] – محمد رشدی عبید، دەروازەیەك بۆ راگەیاندنی ئیسلامی، وەرگێرانی غازی ئیسماعیل میرۆستەمەیی، چاپخانەی کاڵیٚ، چاپی یەکەم، ١٤٢١ك ـ ٢٠٠٠ز، ل٦٤.

[2] – (الجمعة: ٩).

ستایش و پیا هەڵدانی دەسەڵاتداران و سەرۆك و پادشاکان ئەدرێن و گوێ بە بەرژەوەندی مسوڵمانان و بارە ناشەرعیەکان نادرێت, لەو لاشەوە هەندێ کەس وەك پیشە وتار دەخوێنێتەوە, یان بە میراتی بۆی ماوەتەوە کە باوکی مەلا بووە دەبێ ئەویش لە جێی دابنیشێ و مەلا بێت ئیتر باشیاویش نەبێت چ لە ڕووی عیلمییەوە یاخود ئەو پلە و پایەوە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و پابەندبوونییەوە بە بنەما شەرعییەکانەوە، بۆیە لێرەدا, هەندێ خاڵ بۆ وتاری هەینی, تا وەکو ئەرکی ڕاگەیاندنی خۆی جێ بەجێ بکات و ڕۆڵی شیاوی خۆی ببینێ, ئەخەینە ڕوو:[1]

١ ـ پێویستە وتاری هەینی گرنگی و بایەخ بە بارودۆخی نالەباری مسوڵمانان و ئەو هەموو کارەسات و ستەم و ناڕەواییانەی ڕوو بە ڕووی دەبنەوە بدات لە توند و تیژی و ستەمکاری و کوشتن و ڕاوەدوونان و ئاوارە کردن و دەستدرێژی ناموس و تۆمەتی توند ڕەوی و تیرۆر و دواکەوتن و .. تاد.

٢ ـ کاربکات بۆ زیاد کردنی بڕوا لە دڵی مسوڵمانان و هەڵنانیان بە شێوەیەك لە کەشێکی ئیمانی و ئارامی و ملکەچی و دڵسۆزی و ڕاستگۆییدا بژین و خۆیان پاك بکەنەوە لە هەرچەشنە گوناح و تاوانێکی ئاشکرا و نهێنی وەك خۆ بە زلزانین و ڕووپامایی و درۆ و خراپەی تر و دیمەنەکانی ڕۆژی دوایی ئامادەیی پەیا بکەن لە بەر چاویان..

٣ ـ وتارەکە هاوسەنگ بێت لە نێوان (ترساندن) و (مژدەدان) دا و گوێ گران دووچاری بێ هیوایی نەکات و گیانی ئومێدو ورەو باوەڕ بەخۆبوون لە دڵ و دەروونیاندا بڕوێنێ.

٤ ـ ئاگاداربوونی وتاربێژ لە واقیع و ڕووداوەکانی دەوروبەری و دانانی چارەسەر بۆ ئەو گرفت و نەخۆشیانەی دەست نیشانیان دەکات لە کۆمەڵدا و بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و واقیع بیان سەلمێنێ, نەك تەنیا گرفتەکان تەرح بکات و هیچ چارەسەرێکی پێ نەبێت, بەڵکو دەبێ ئەلتەرناتیڤی ئیسلامی بخاتە ڕوو.

٥ ـ وتار دەبێ ئاڕاستەی هەموولا بکرێ نەك تەنها بۆ هاوولاتی ئاسایی بێت و دەسەڵاتداران نەگرێتەوە, ئەبێ هەموان ئاراستە بکات کە بە ئەرکی خۆیان هەڵسن.

---

[1] ـ بڕوانە: رؤى في مسار العمل الاسلامي، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٧ـ ٧٢. ابراهیم اسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦ـ ٣٧. محمد رشدی عبید، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٠ـ ١٠١.

٦ ـ بایەخدان بە مەسەلەکانی ڕۆژو ڕووداوەکان کە زۆر و زەبەنەن بەپێی گرنگی و ئەولەویەت.

٧ ـ بەڵگە هێنانەوە بە ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ بەڵگەی واقیع و وتەی زانایانی ئیسلام بۆ سەلماندنی بابەتی وتارەکە.

٨ ـ بەکارنەهێنانی وشەی زامدارکەر و بێزارکەر کەوا لە نوێژخوێنان و گوێگرانی وتار بکات بتارێن, وە دەبێ وشەی ناشایستە لە ڕووی شەرعییەوە یان جنێو و ناوزڕاندن بە کار نەهێنرێت لە وتاردا وەك جنێو یان قسە وتن بە وانەی کە دوورن لە ئاینداری و بەوەش قسە و جنێو بە نەزانین بە خوا بدەن وەك خودا لە قورئاندا ڕوونی کردۆتەوە.

٩ ـ ڕەچاو کردنی باری ئامادە بوان و جیاوازییان لە تەمەن و کار و بار و تەندروستییان.

١٠ـ پەلە نەکردن لە بە دەست کەوتنی بەرهەمی وتاری هەینی و بێ هیوا نەبوون لە کاریگەر نەبوونی وتار بە شێوەیەکی بەرچاو و بەردەوام بوون و پشوو درێژی.

## نامە و پەیام

یەکێ لە هۆ و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن, بریتییە لە نامە و پەیام ناردن بۆ کەسی مەبەست بۆ ئاگادار کردنەوەی لە پەیامێك, هەواڵێك, شتێکی گرنگ یان هەرشتێکی دیکە, ئەمەش مێژوویەکی کۆنی هەیە, خوای گەورە باسی سولەیمان پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە (سڵاوی خوای لە سەر بێ) کە چۆن نامەیەکی نووسیوە و بە پەپوسلێمانە (هود هود) دا ناردوویەتی بۆ شاژنی سەبا لە یەمەن (بەلْقیس), و پاشانیش نامەکە کاریگەری خۆی بووە و مسوڵمان بوون و وەڵامی پەیامەکەیان بە ئیجابی داوەتەوە.[1]

پێغەمبەری ئیسلامیش (ﷺ) لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا, چەندین نامەی نووسی بۆ پادشا و فەرمانڕەواکانی ئەو سەردەمە و داوای لێکردن واز لەوە بێنن کە لە سەرینی و باوەڕ بە ئایینی تازە بێنن, لەوانە نامەی نووسی بۆ هەریەکە لە (نەجاشی پاشای حەبەشە, هیرقل پاشای ڕۆم, کیسرا و چەندین فەرمانڕەوای عەرەب لە ناوچە جۆر بە جۆرەکاندا), کە

[1] – قورئانی پیرۆز، سورەتی (النمل) ئایەتی: ٢٨ـ ٣١.

هەندێ لەو پادشا و فەرمانڕەوایانە وەك (نەجاشی) مسوڵمان بوون و هەندێکیشیان سەرکەشییان کرد و دژایەتی خۆیان بۆ پێغەمبەر و پەیامەکەی دەربڕی.[1]

دوای ئەو مێژووەش, تا وەکو ئەمڕۆ سوود لە نامە و نووسراو و پەیام ناردن وەرگیراوە و وەردەگیرێ, وا ئەمڕۆ لە ڕێی ئینتەرنێت و فاکس و تەلەگراف و مۆبایل.. نامە دەنێردرێ و پەیام و مەبەست ئاڵوگۆڕ دەکرێ وەك هۆیەکی ڕاگەیاندن و پەیوەندی کردن.

## ڕاگەیاندنی ئیسلامیی لە کورستاندا

ڕاگەیاندنی ئیسلامیی کوردیی, دوو جۆرە:

یەکەمیان: ڕاگەیاندنی حیزبی و دووەمیان ڕاگەیاندنی سەربەخۆ, ڕاگەیاندنی حیزبی, بریتییە لە ڕاگەیاندنی لایەنە ئیسلامیەکان لە کوردستاندا کە هەموو بەشەکانی نووسراو و چاپکرا و لە ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب و بڵاوکراوە و نامیلکە و پەیام و بەیانات, و هۆکانی ڕاگەیاندنی بیستراو لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن و کاسێت و وتار, و بینراویش لە تەلەفزیۆن و سایتی ئینتەرنێت و پێشانگا و وێنە و شتە نووسراوەکانی تر.. لە خۆدەگرێ.

ڕاگەیاندنی سەربەخۆش تا ئێستا, کتێب و نامیلکە و بڵاوکراوە و ڕۆژنامە و گۆڤار و کاسێت و وتار و کۆڕ و سمینار و سایتی ئینتەرنێت.. لە خۆ دەگرێت.

ئەمە لە پاڵ ڕاگەیاندنی چەند ڕێکخراوێکی پیشەیی وەك یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان و ڕێکخراوەکانی قوتابیان و ئافرەتان و مامۆستایان.. هەروا ڕاگەیاندنی وەزارەتی ئەوقاف و کار و باری ئایینی هەرێمی کوردستان.

تاکو هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو (سەدەی بیستەم), ڕاگەیاندنی ئیسلامیی کوردیی, تەنیا لە چوارچێوەی بڵاوکردنەوەی کتێب و نامیلکە و کاسێت و وتاردان بە تایبەت وتاری هەینی داو, خوێندنەوەی مەولود نامە و میعراجنامە و.. دا مابوویەوە, بەڵام لەو بەروارە بە دواوە و بە تایبەت لە هەشتاکان و نەوەدەکان و بە تایبەتیش دوای ڕاپەرینی ئازاری ساڵی (١٩٩١)ی گەلەکەمان لە کوردستانی عێراق, ڕاگەیاندنی ئیسلامیی پێی نایە

---

[1] – بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت بەو نامانەی بۆ پادشاو سەرۆکو فەرمانڕەواکانی جیهان لەو کاتەدا نێردراون، بڕوانە: دکتۆر محمد سعید رمضان البوطي، فقه السيرة، انتشارات لقمان، چاپی یەکەم، قم، ١٣٦٩ هـ ش. ل ٣٣٩ـ ٣٤٦. هەروەها بڕوانە: ابراهیم اسماعیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨.

قۆناغێکی تازەوە و بە دەیان گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاو کراوەی ئیسلامیی کوردی بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی دەرچوون, کە هەندێکیان ئۆرگانی حیزب و لایەنە سیاسی و ڕێکخراوەکان بوون و هەندێکی تریان سەربەخۆ و بێلایەن, پاشانیش ڕۆژنامەگەریی ئیسلامیی پێشکەوتنی باشی بە خۆوەبینی و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی کوردیی گۆڕانێکی جۆری بە خۆوەبینی کە هۆکانی تری وەك تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ئینتەرنێتی بەکارهێنا. هەموو ئەوانە, بە گشتی ڕۆڵی باشیان بینی, واتە ڕاگەیاندنی ئیسلامیی کوردیی ڕۆڵی ئیجابی و باشی بینیوە سەرباری ئەو گرفت و کۆسپ و تەگەرانەی ڕوو بە ڕووی بۆتەوە, لە بایەخدان بە خووڕەوشت و داب و نەریتی ئیسلامی گەلی کوردستان و بەرگری کردن لە مافەڕەواکانی ئەو گەلە و گەیاندنی ستەمدیدەیی گەلی کورد بە جیهانی دەرەوە و هۆشیار کردنەوەی جەماوەر لە پیلان و نەخشەی ناحەزانی ئیسلام و پەروەردە کردنیان لە روانگەی پەیامی ئیسلامەوە, لە پاڵ بایەخدان بە تەبایی و ئاشتی و ئارامی و پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلەکەمان و ڕێنمایی کردنی ڕابوونی ئیسلامی و لاوان بە گشتی بە ئاراستەیەکی دروست و تەندروست.

لەگەڵ هەموو ئەو دەور و ڕۆڵەی ڕاگەیاندنی ئیسلامیی کوردیی تا هەنووکە بینیویەتی, بەڵام دەتوانین بڵێین کە هێشتا ماویەتی بگاتە ئاستی خواستەکانی مسوڵمانان لە کورستان و پێویستە هەنگاوی زیاتر بنێت و بە شێوەیەکی زانستیانە و هاوچەرخانە ڕابەڕایەتی جەماوەر بکات و بە چڕی بچێتە نێو کۆمەڵانی خەڵکەوە و هۆشیاریان بکاتەوە, ئەمەش بە سوودوەرگرتن لە هۆودام و دەزگا و ڕاگەیاندنی نوێ و هاوچەرخ بۆ ئەوەی ئەو شتانەی پێشکەشی دەکات, شتی جددی و جێی گرنگی و بایەخی خەڵك و ڕەنگدانەوەی پێویستیەکانی ڕابوون بن لە کوردستان و ناوچەکە .

بە داخەوە تا ئێستا ڕاگەیاندنی ئیسلامیی, چەشنی ڕاگەیاندن بە گشتی لە کوردستاندا, لە سنوورێکی بەرتەسکدایە و چوار چێوەی حیزبایەتی تێنە پەڕاندووە.

بە کورتی دەڵێم: پێویستە ڕاگەیاندنی ئیسلامیی لە کوردستان, وێڕای ڕەچاو کردنی ئەرکەکانی ڕاگەیاندنی ئیسلامیی کە لە پێشەوە باسمان کردن و جێ بە جێ کردنیان, هەوڵبدات خۆی بە هێز و تۆکمە تر بکات و بە پێی تایبەتمەندی و بارودۆخی کوردستان خزمەت بە پەیامی ئیسلام و گەلەکەمان بکات و بەرهەمەکانی خۆی پێشکەش بە کۆمەڵگای کوردستان بکات, ئەو هێرشانەی دەکرێتە سەر ئیسلام و مسوڵمانان و مێژووی

ئیسلامی گەلەکەمان، بەرپەرچ بداتەوە، وە ڕاگەیاندنی لایەنە ئیسلامییەکان گەرەکە هاوکاری یەکتر بکەن و هەماهەنگی لە نێوانیاندا هەبێت و سوود لە بەهرە و توانا و ئەزموونی یەکتری وەربگرن و پێکەوە پلانێکی ستراتیژی پێڕە و بکەن کە بتوانن پڕۆژەیەکی ڕۆشنبیری ئیسلامیی نەتەوەیی دابڕێژن، کە ببێتە هۆی یەکبوونی هەموو لایەنەکان و یەك گوتاری و هاوهەڵوێستی لە مەسەلە هاوبەش و چارەنووسسازەکاندا.

# بەشی سێیەم:
# ڕاگەیاندن و ڕۆڵ و کاریگەرییەکانی و پەیوەندی لەگەڵ سیاسەت و ڕای گشتیدا

لەم بەشەدا, دەمانەوێت لە بارەی پەیوەندی نێوان ڕاگەیاندن و سیاسەت لە لایەك و شێواز و کاریگەرییەکانی ڕاگەیاندن لە لایەکی تر و هەروا ڕای گشتی لە پێوەندی لەگەڵ ڕاگەیاندندا و واقیعی هەنووکەیی ڕاگەیاندن.. بدوێین.

## پێوەندی نێوان ڕاگەیاندن و سیاسەت

پەیوەندییەکی بە هێز لە نێوان ڕاگەیاندن و سیاسەتدا هەیە, کە دەکرێ بڵێین ڕاگەیاندن و سیاسەت دوو ڕووی یەك دراون بە هۆی ئەو پەیوەندیە تێك هەڵکێش و ئاڵۆزەی لە نێوانیاندایە, تێڕوانین و توێژینەوە سیاسیە جۆر بە جۆرەکانیش جەخت لە سەر پەیوەندی پتەوی نێوان زانستی سیاسەت و ڕاگەیاندن دەکەنەوە لە میانەی لێکۆڵینەوە و تاوتوێ کردنی ماهییەتی زانستی سیاسەت و چەمکی سیستەمە سیاسیەکان و جۆرەکانیان و هەروا بیردۆزەو سیستەمە ڕاگەیاندنە جۆر بە جۆرەکان کە پێوەندی بە هێزیان بە گەشە کردن و پێشکەوتنی سیستەمە سیاسیەکان و ئاڵو گۆڕەکانیانەوە هەیە, ئەم پێوەندی و کاریگەرییەی کە ڕاگەیاندن لە سەر ئاستی ناو خۆی هەر وڵاتێك لە سەر هاوڵاتیانی خۆی هەیەتی و ڕای گشتی و ئاراستەی سیاسییان بۆ دروست دەکات, هەروەها لە سەر ئاستی دەرەوەش ئەو کاریگەرییە بە هێزەی کە هەیەتی لە دروست کردن و داڕشتنی سیاسەتی دەرەوە لە میانەی ڕۆڵی ڕاگەیاندنی نێو دەوڵەتی لە دروست کردنی وێنەیەکی زهنی وا لە لای تاکەکان و گەلان کە دەکرێ شوێن دابنێ لە سەر سیاسەت و بڕیارەکانی وڵاتان لە هەمبەر ئەو گەلانە, بەڵگەیەکی ڕوونە لە سەر وتەکانمان.

توێژینەوەکانی پێوەندیکردن ئاماژە بە گرنگی لایەنی پێوەندیکردنی سیاسی (ڕاگەیاندنی سیاسی) لە بەهێزکردنی چەمکە سیاسیەکان بە شێوەیەکی گشتی دەکەن,

هەروەها پێوەندی لە نێوان جەماوەر و جێبەجێکردنی سیاسەت لە ژێر ڕۆشنایی چوارچێوەی گشتی بۆ خزمەتی کۆمەڵگا.

ئەلمۆند almond وتەیەکی بە ناوبانگی هەیە دەڵێ: "هەمووشتێك لە سیاسەتدا پێوەندییە لە باری چییەتی ئەرك و قۆناغە فرە چەشنەکان کە هۆکانی ڕاگەیاندن پێی هەڵدەستن لە خزمەتی سیستەمی سیاسیدا, بە شێوەك کە وادەکەن ئەستەم بێ سیستەمە سیاسیەکان بە بێ پشت بەستن بە هۆکانی ڕاگەیاندن بژین".[1]

لێکۆڵەری ئەمریکی چیفتی chaffee ش جەختی لە سەر ئەوە کردۆتەوە کە جۆرێك لە تێك هەڵکێشی بە هێز هەیە لە نێوان سیاسەتەکانی جیهان و تەکنیکییەکانی هۆکانی ڕاگەیاندندا, کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری ( قەیسەر) لە سەردەمی ڕۆمانی کۆندا, بایەخیشی لە چەرخی نوێدا زیاتر بووە چونکە وای لێهاتووە سەختە تاك بتوانێ حکومەتی خۆی هەڵبژێرێت بە بێ هۆکانی ڕاگەیاندن...[2]

ئەمڕۆ ڕاگەیاندن و هۆکانی پێوەندیکردن, وەك زەروورەتێکی لێهاتووە لە کۆمەڵگەدا و تاك ناتوانێ بێ ڕاگەیاندن و پەیوەندیکردن بژیت کە کاریگەری زۆری لە سەر سروشت و پێکهاتەی کۆمەڵگا و لەوانەش لەسەر سیستەمی سیاسی هەیە, تەنانەت چالاکییە سیاسییەکان بە دژواری ئەنجامدەدرێن کە هۆکانی ڕاگەیاندن و پێوەندیکردن لە ئارادا نەبن, ئەو پەیوەندیە بە هێزەی نێوان هەردوو لای (سیاسەت و ڕاگەیاندن) هەندێك وەك پێوەندی نێوان (هەنگ و هەنگوین) یان گوزارشت لێکردووە.

توێژەرەوانی بواری سیاسەت و پێوەندیکردن, جەخت لە سەر گرنگی و بایەخی پەیوەندی نێوان سیاسەت و ڕاگەیاندن دەکەنەوە, بەوە کە هەریەکەیان کاریگەری هەیە لە سەر ئەوی تریان و دەکەوێتە ژێر کاریگەریشەوە, ڕاگەیاندن دەبێتە ئەڵقەی وەسڵی نێوان دەسەڵات و جەماوەر و نوخبە, دەسەڵاتی سیاسی لە لایەکەوە کاریگەری هەیە بەوە کە زۆربەی هۆکانی ڕاگەیاندنی لە بەردەستدایە و ئاڕاستەی جەماوەر بەلای ئەوەدا ئەبات کە خۆی دەیەوێت و لەو سۆنگەوە پەیامەکانی پێشکەش دەکات, لە لایەکی تریش راگەیاندن کەناڵێکی

---

[1] – دکتورە حنان یوسف , الاعلام والسیاسة مقاربة ارتباطبة, سەرچاوەی پێشوو, ل ٧١.

[2] – سەرچاوەی پێشوو, ل ٧١.

سەرەکییە بۆ گەیاندنی دەنگی خەڵك و خواستەکانیان بە حکومەت و ناوەندی بڕیاری سیاسی و گوزارشتکردن لە بەرژەوەندییەکانیان.

لەو نێوانەدا, وەرگر پشت بە هۆکانی ڕاگەیاندن دەبەستێت وەك پردێك لە نێوان خۆی و خاوەن بڕیاری سیاسیدا, بۆیە زانایانی بواری سیاسەت وا وەسفی ڕاگەیاندنیان کردووە کە بووەتە میانجیگەر (**وسیط**) لە دروست کردنی بڕیار و سیاسەتەکاندا, و بەشدارە لە پڕۆسەی سیاسیدا لە میانی پێداگرتن و جەخت کردنەوە لە سەر چەند پرسێکی دیاریکراو کە ڕەنگە بیرو هۆشی تاکەکان بگۆڕێت یان بە هێزی بکات.[١]

بەش یان لقی ڕاگەیاندنی سیاسی لە لقەسەرەکییەکانی بواری ڕاگەیاندن دێتە ژمار لەو کاتەوەی پەیوەندی لە نێوان جەماوەر و هۆکانی ڕاگەیاندندا دەستی پێکردووە, هەر بۆیەش زانایان و توێژەرەوان هاتوون لە سروشتی ئەو پێوەندیەیان کۆڵیوەتەوە کە لە نێوان ڕاگەیاندن و سیاسەتدا هەیە, بۆ نموونە هۆلاندەر (G.Holl ander) لە ساڵی (١٩٧٢)دا داکۆکی لەوە کردووە کە ڕاگەیاندنی جەماوەریی لە سەردەمی (ستالین)ی سەرۆکی سۆڤیەتی پێشوو, ڕەنگدانەوەی سیاسەتەکانی ئەوسای سۆڤێتی بووە, و یەك لە هۆکارەکانی پەرەپێدان و بانگەشە کردن بووە بۆ ئامانجەکانی ئەو سیاسەتانەی ستالین و هەر بەشدارییەکی جەماوەریش لە کۆمەڵگاکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو ئەوەستا لە سەر ئەو پەیامە ئیعلامیانەی هۆکانی ڕاگەیاندنی دەوڵەتەکەی ستالین پێشکەشیان دەکرد و کاریگەر دەبوون پێیانەوە, لە چین, تەلەفزیۆن ئامرازێکە بە دەست حکومەت و حیزب کە سەدان ملیۆن کەس لە گەلی چینی میللی پشتی پێ دەبەستێت هەروا هۆکانی تری ڕاگەیاندن کە پەیوەندی لە نێوان حکومەتەکانی ئەو وڵاتە و میدیادا بە هێز دەکات.[٢]

ئەم نموونانە ڕادەی پەیوەندی نێوان ڕاگەیاندن و سیاسەت دەردەخەن لە گشت سیستەمە سیاسیەکانی ئێستای دنیادا هەروەها لە سیستەمە ئیعلامیەکانیشدا: شمولی و تۆتالیتاری, لیبڕالی, دیموکراتی, بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی... کەوابوو, ڕاگەیاندن بۆتە زەرورەتێکی سەردەم لە کۆمەڵگادا, هۆکانی ڕاگەیاندنیش هەندێ جار دەبنە هۆیەکی پێویست و تەواو بۆ کاریگەری سیاسی و هەندێ جاریش دەبنە هۆیەکی پێویست بەڵام ناتەواو , پەیوەندی

---

[1] – **هەمان سەرچاوەی پێشوو, ل ٧٦.**

[2] – **هەمان سەرچاوەی پێشوو, ل ٧٧.**

نێوان ئیعلامیەکان و سیاسیەکان لە ڕوویەکی تریشەوە دەتوانین سەیر بکەین و تێبگەین, کە ئیعلامییەکان سەیری سیاسەتمەداران دەکەن و چاوەڕوانی بڕیار و لێدوان و پێوەندییان لەگەڵ جەماوەر دەکەن و سیاسییەکانیش پشت بە ڕاگەیاندن دەبەستن لە گواستنەوەی بڕیار و ڕاسپاردەکانیان بە جەماوەر و ڕوونکردنەوەی سیاسەتەکانیان.

جا پێوەندی لە نێوان سیاسەت بە مانا باوەکەی کە هونەری بەڕێوە بردن و فەرمانڕەوایی و دەوڵەتداری[1] و ڕاگەیاندنیش بەو پێناسەیەی لە پێشەوە کردمان, لە دوو ئاستدا دەتوانین قسەی لە سەر بکەین هەروەك لە سەرەوەش ئاماژەمان پێدا, لە سەر ئاستی سیاسەتی ناو خۆ و چۆنێتی دروستکردنی ئاراستەی سیاسی بۆ هاوولاتی لە میانەی پێشکەش کردنی پەیامگەلێکی سیاسی ئیعلامی بە جەماوەر و وروژاندنی مەسەلە گەلێك بە ئامانجی کارتێکردن لە تاکەکان و ئاراستە کردنیان بەو شێوەیەی دەسەڵاتی سیاسی دەیەوێت و سەرەنجام پێکانی مەرامەکانی خۆی لە میانەیدا, ئەم کاریگەریی و شوێن دانانەی ڕاگەیاندنمان زۆر بینیوە و ڕوویداوە لە مێژووی دوور و نزیکدا کە ڕاگەیاندن توانیویەتی تەئسیر بەخش بێ لە سەر سلوك و رەفتاری وەرگر لەگەڵ چەندین فاکتەر و ئیعتیباراتی تری نەفسی و کۆمەڵایەتی.

لە سەر ئاستی دەرەوەش, ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێ لە دروست کردنی سیاسەتی دەرەوە و ئیدارە کردنی ململانێ نێو نەتەوەییەکان و پاراستنی ئاشتی جیهانی لە میانی پتر کردنی قەبارەی زانیارییەکان لە نێوان نەتەوەکاندا و لە یەك نزیك خستنەوەی ڕاو بۆچوونەکان و دەست نیشانکردنی خاڵە ناکۆکەکان و توانای زاڵ بوون بە سەریاندا, هەروەها ڕۆڵ و نەخشی لە چارەسەرکردنی کێشە و ململانێ و یەکلاکردنەوەی گرفت و قەیرانەکان لە ڕێگەی وتووێژ و ناوبژیوانییەوە.[2]

ڕیشەی مێژوویی بە کارهێنانی پەیوەندیکردن و ڕاگەیاندن لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا, دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە هەزاران ساڵ, بەڵام لە مێژووی بزووتنەوەکانی پێوەندیکردن و بانگەشەی سیاسەتی دەرەوەدا, دەکرێ هەڵوەستە بکەین لە سەر دیاردەی پێوەندیکردنی

---

[1] – بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە پێناسەی سیاسەت, بڕوانە: الدكتور قحطان أحمد سليمان الحمداني، الاساس في العلوم السياسية, الطبعة الاولى, دار مجدلاوي للنشر والتوزيع, عمان, ٢٠٠٤, ص١٥ وما بعدها.

[2] – دكتورە حنان يوسف, سەرچاوەی پێشوو, ل ١٢١.

ئیسلامی و بە کارهێنانی ڕاگەیاندن و هۆکانی پێوەندیکردن لە بواری بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی لە هەموو جیهاندا, کە ئەوەبوو مسوڵمانەکان پشتیان بە چەندین بنەما و تەکنیکی نوێ دەبەست بۆ بانگەشە و بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و بەرنامە بۆ دانرا و بۆ گەیشتن بە بەدیهێنانی نەخشە و پلانی سیاسەتی دەرەوە لە بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامدا.

چونکە ئایینی ئیسلام یەکەم پەیام و ڕێبازێکە پرۆگرامی داناوە بۆ زانستی پێوەندیە نێودەوڵەتیەکان و ڕێساکانی سیاسەتی دەرەوە لە دەوڵەتی تازەی ئیسلامیدا,[1] وە هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بانگەوازی ئیسلامیدا, ڕێگای دبلۆماسیەت و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان گیرایە بەر بۆ بەهێزکردنی پایەکانی دەوڵەت و دەرخستنی ڕەوشت و ئاکاری مسوڵمانان و ڕەفتار کردنیان لە گەڵ غەیری خۆیاندا.

ئیسلام بەوە ناسراوە کە ئایینی سیاسەت و بانگەوازە پێکەوە, بانگەوازیش (**الدعوة**) هەمان مانای ڕاگەیاندن دەبەخشێ چ لە سەر ئاستی تیۆری و چ لە سەر ئاستی کرداری, لە قورئانی پیرۆزدا چەندین ئایەت هەن کەتیایاندا چەمکی ڕاگەیاندن و بانگەشە و بانگەواز یان پێوەندیکردن دەردەکەوێ و ئەرکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕاگەیاندنی پەیامی خوادا ڕوون دەکەنەوە, وەك ئەم ئایەتە پیرۆزانە: (... **إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ** ...),[2] واتە: تۆ (ئەی پێغەمبەر) هەر تەنیا ئەوەندەت لە سەرە پەیامەکە ڕابگەیەنی.

(... **فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاَغُ الْمُبِينُ**),[3] واتە: ئەگەر پشت هەڵبکەن و لە فەرمان دەربچن, ئەوا بزانن کە پێغەمبەری ئێمە جگە لە پێ ڕاگەیاندنی ئاشکرا و ڕوون هیچی تری لە سەر نییە.

(**يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً * وَدَاعِياً إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجاً مُّنِيراً**),[4] واتە: ئەی پێغەمبەر! ئێمە تۆمان ناردووە کە شایەت و مژدەدەر و ترسێنەر بی, و بانگەواز بۆ لای خوا بکەی بە ئیزنی ئەوو چرایەکی درەوشاوە و تیشکدەر بی.

---

[1] – هەمان سەرچاوەی پێشوو, ل١٢٣.

[2] – سورەتی (شورا), ئایەتی (٤٨).

[3] – سورەتی (مائیدە), ئایەتی (٩٢).

[4] – سورەتی (ئەحزاب) , ئایەتی (٤٥، ٤٦).

(ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ...).[١]
واتە: بە کارزانی و ئامۆژگاری جوان خەڵك بەرەو ڕێگەی پەروەردگارت بانگ بکە و بە چاکترین شێوە لە گەڵیاندا بدوێ.

هەروەها ئایینی ئیسلام ڕاگەیاندنی وەك وەسیلەیەکیش بۆ جەنگی دەروونی بەکارهێناوە بۆ دروستکردنی پەرتەوازەیی لە نێو ڕیزی دوژمندا و بڵاوکردنەوەی دڵەڕاوکێ و گیانی ڕووخان و لێکترازان لە نێویدا کە ئەمەش بەشێکە لە شەڕ و جەنگ, چونکە (**الحَربُ خدعة**),[٢] واتە: شەڕ بریتییە لە فێڵ و پلان و هەڵخەڵەتاندنی دوژمن.

## شێواز و کاریگەرییەکانی ڕاگەیاندن

### یەکەم: شێوازەکانی ڕاگەیاندن

ڕاگەیاندن بۆ ئەوەی پەیامەکانی خۆی بە جەماوەر بگەیەنێ و دواتر کاریگەریی لە سەر وەرگر دروست بکات, چەند شێوازێك بە کار دێنێت, کە بە کورتی باسیان دەکەین:[٣]

**١ ـ شێوازی چاودێریکردن و دووبارەکردنەوە:**

دووبارەکردنەوەی ئەو پەیام و چەمکانەیە بۆ جەماوەر کە لە لایەن ڕاگەیاندنێکەوە دیاریکراون و دەویسترێت بەرجەستە بکرێن, بۆیە ڕۆژانە دووپات دەکرێنەوە لە کەناڵەکاندا, تا ئەو چەمك و دەربڕینانە دەبنە ڕاستەقینەیەکی چەسپا و لای خەڵك و بە تەواوی بڕوایان پێدەکەن.

**٢ ـ شێوازی خۆلێگێل کردن و لێبێدەنگ بوون:**

بریتییە لەوەی کە دامەزراوەیەکی ڕاگەیاندن یان دەوڵەتێك, هەڵەیەك دەکات و کارێك دەشێوێنێت, پاشان خۆی لە باسکردنی دەپارێزێت و گێل دەکات و دەیەوێت لە بیر خەڵکی بباتەوە, وەك ئەوەی لە کاتی دەسەڵاتی ستالیندا لە یەکێتی سۆڤیەت, کۆمۆنیزم لە

---

1 – سوورەتی: (نەحل)، ئایەتی: (١٢٥).

2 – فەرموودەیەکی پێغەمبەرە (ﷺ)، بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە, بڕوانە: ئیمامی نەوەوی, ریاض الصالحین, سەرچاوەی پێشوو, ل ٣٨٨ (کتاب الجهاد).

3 – بڕوانە: هەڤاڵ ئەبوبەکر, سەرچاوەی پێشوو, ل٥٠ ـ ٥٣ .

مۆسکۆ خۆی گێل دەکرد و بە تەواوی خۆی لادەدا لەو کارانەی دژ بە ڕەفتارەکانی کۆمۆنیزم لە سۆڤیەت و ئەوروپای خۆرهەڵات ئەنجامدەدران و بەرپەرچی نەئەدانەوە.

**٣ ـ شێوازی دزەکردن و گۆڕینی ئاگایی:**

بریتییە لە دزەکردن بۆ نێو گەرم و گوڕی ڕای گشتی و گۆڕینی تێڕوانینی جەماوەر لە ڕووداوێکی گرنگەوە بۆ ڕووداوێکی تر, بۆ گۆڕینی ئاگایی خەڵك لە سەری و کەم کردنەوە و سوککردنی فشار لە سەر دەسەڵات.

نموونەی ئەمەش, لە هاوینی ساڵی ١٩٨٠, سەندیکاکان لە سوریا مانیانگرت و دوکان و بازاڕەکان داخران و خەڵك باسی چەوساندنەوەی جەماوەر و گەندەڵی دەسەڵاتیان دەکرد, بەڵام ڕاگەیاندنی سوریا خۆی لە باسکردنی ئەو مەسەلەیە بوارد و خۆی بە مەسەلەی ئەو دوو فڕۆکە سورياییە خەریك کرد کە لە هێرشێکیاندا لەگەڵ فڕۆکەکانی ئیسرائیلدا لە سەر ئاسمانی لوبنان تێك شکێنران.

نموونەیەکی تر, لە ساڵی ١٩٨٨ هەزاران مرۆڤ لە سودان لە برسان گیانیان لە دەستدا و ٣٠٠ قوتابی لە زائیر کوژرانەو[1], (٥٠٠٠) هەزار کەس لە شاری هەڵەبجەی کوردستانی عێراق بە گازی کیمیایی لە سەردەستی ڕژێمی بەعس گیانیان لە دەستدا و هەزارانی تریش زامدار بوون, کەچی ڕاگەیاندنەکان ئەمانەیان خستە پەراوێزەوە و تیشکەکان خرانە سەر ئەوسێ (نەهەنگە بۆرەی ئۆقیانووسی باکوور) کە لە بەستەڵەکی باکووردا گیریان خوارد بوو و عاسێ ببوون, ئەوە بوو ئەمریکا و وڵاتانی تری ئەوروپا (٩) ملیۆن دۆلاریان خەرج کرد بۆ ئەوەی ئەوسێ نەهەنگە رزگار بکەن, روسیاش بۆ ئەوەی پشکی لەم بەشە خێرەدا هەبێت, هەروەك پێشتر بە بۆمب و سارووخی کیمیایی خێری سەخاوەتمەندانەی بەعێراق کردبوو, ئامێرێکی سەهۆڵ شکاندنی پێشکەش بە ڕێکخراوی (ئاژەڵ دۆستانی جیهان) کرد تا ئەو ئاژەڵانە رزگاریان بێت!![2] سەیرە دەیان هەزار کەس، بەڵکو شار، یان وڵاتێك بە تێکڕا نرخی ئەوەندەی سێ ئاژەڵیان نییە!!

---

[1] – محمد رشدی عبید، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤.

[2] – ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی: لە یادی کیمیابارانی هەڵەبجەدا.. باشترین ئەمەکداری لاکردنەوە لە زیندووەکانی و ڕاستکردنەوەی کەلاوەکانیەتی, ڕۆژنامەی (بزووتنەوەی ئیسلامیی), ژمارە ( ١٠٧)ی ڕۆژی ١٦/ ئازاری ٢٠٠٢ ز, ل٥ .

**٤ ـ شێوازی وروژاندن و سۆز جووڵاندن:**

ئەم شێوازە کار لە سەر ناسینی سۆزی خەڵك و وروژاندنی دەکات و بەو ئاقارەدا کە مەبەستیەتی ئاراستەی دەکات, بۆ ئەم هەنگاوەش گرنگ نییە هەر وەسیلەیەك گەر درۆ و پڕوپاگەندەش بێت بەکاربرێت, زیاتر ئەو پارتانەی خاوەن ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراون بە کاری دێنن.

**٥ ـ شێوازی ڕاشکاوی و ئاشکرا کردنی ڕاستییەکان:**

بریتییە لەو شێوازەی دەیەوێت ڕاستییەکان بگەیەنێت بە خەڵك و ڕێز لە سۆزیان بگرێت دوور لە بە کارهێنانی درۆ و چەواشەکاریی, ئیدی پەیامەکان بە جەماوەر دەدرێن و بڕیار لە سەردانیان بۆ ئەوان جێدەهێڵرێت, ئەم شێوازە بە زۆری لە وڵاتە دیموکراسیەکاندا پەیڕە و دەکرێت, بۆ ئەوەی هاووڵاتیان بەشداریی لە بڕیاردا بکەن و زیاتریش ئەمە لە کاتی قەیران و گرفتە چارەنووسسازەکاندا دەبێت.

**٦ ـ شێوازی تەواوکاریی:**

ئەم شێوازە پشت بە واقیع دەبەستێ نەك بە خەیاڵ و دەیەوێت بە وشەی ڕاست و دروست و بیری ئامانجدار و بەڵگەی پتەو و بە بەرنامەیەکی باشەوە خەڵك هۆشیار بکاتەوە و پەروەردەی تەندروست و ڕێنمایی چاکیان بکات.

**٧ ـ شێوازی تۆقاندن:**

بریتییە لەو شێوازەی زۆرێك لە میدیاکانی ڕاگەیاندنی ئەمڕۆ بەکاری دەبەن, بە ترساندنی خەڵك و دروستکردنی کەشێکی پڕ لە ترس و دڵەڕاوکێ و تۆقاندنی خەڵکی و وا تێگەیاندنیان کە لە بەردەم ئایدیۆلۆژیا, یان گروپ, یان وڵاتێکی ترسناکدان وەك وەسف کردنیان بە تیرۆریست و خەتەر لە سەر مرۆڤایەتی و دڕندە، ئیدی ئەم شێوازە لە هەوڵی بە پەسەند زانینی بیروڕای خۆی و ناشیرین کردنی بەرامبەر و بە دوژمن و تێکدەر و یاخی لە قەڵەمدانی و هاندانی جەماوەردایە کە خۆیان بپارێزن لێی و بەرەنگاری ببنەوە.

## دووەم: کاریگەریەکانی ڕاگەیاندن

کاریگەری هۆکانی ڕاگەیاندن لە سەر جەماوەری وەرگری پەیامەکانی ڕاگەیاندن، شتێکی بەڵگەنەویستە و پێویستی بە سەلماندن نییە, ئەمە گشت توێژینەوە زانستییەکان جەختی لە سەر دەکەن. بۆیە لێرەدا گرنگترین شێواز و تیۆرەکانی کاریگەری هۆکانی ڕاگەیاندن باس

دەكەین كە بەرهەمی دێنن و خەڵكی ڕووبەڕووی دەبنەوە, لەگەڵ جۆرەكانی و مەرجەكانی ئەو كاریگەرییە.[1]

**أ. كاریگەرییەكان:**

**١ـ كارتێكردنی ڕاستە و خۆیان یان كورتخایەن ـ short – termeffect:**

ئەم تیۆرە وای دەبینێ كە پەیوەندی مرۆڤ بە ناوەڕۆكی پەیامی ڕاگەیاندنەوە، پەیوەندییەكی كارتێكردنی خێراو ڕاستەوخۆیە، واتە پەیامی ڕاگەیاندن، بەهەر وەسیلەیەكەوە بگوازرێتەوە ـ ڕۆژنامە، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن.. ـ لە ماوەیەكی كورتو ڕاستەوخۆ كاریگەری لەسەر مرۆڤ دەبێت، بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤ دیمەنی كوشتنو توندوتیژی لە تەلەفزیۆندا ببینێ، ئەوا ـ بە پێی ئەم تیۆرە ـ كاریگەری لەسەر جێدێڵێو هەوڵ دەدات لە واقیعی ژیانی خۆیدا پراكتیكی بكات. ئەم تیۆرە، تیۆری گوللەشی پێدەگوترێت.

**٢ـ كارتێكردنی درێژخایەن، یان كەڵەكەبوون ـ Long – Termeffect:**

ئەم تیۆرە پێی وایە كە كاریگەری هۆكانی ڕاگەیاندن لە سەر خەڵكی، كاتێكی درێژخایەنی دەوێت تاكو شوێنەوارەكانی لەسەر وەرگرەدەردەكەوێت لە میانی پرۆسەیەكی كەڵەكەبوونی زانیارییەكاندا، كە لە كۆتاییدا دەبێتە هۆی گۆڕینی هەڵوێستو بیروباوەڕو قەناعەتەكانو ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر ڕەفتارو هەڵسوكەوتی تاكەكان، واتە كاریگەرییەكە كورتخایەن نییەو زەمەنێكی دەوێت.

**٣ـ تیۆری خۆراك پێدان یان كوتانی هزری مرۆڤەكان بۆ دروستكردنی بەرگریی (المناعة) تیایاندا ـ Innoculation Theory:**

بە واتای وەرگرتنی چەند ژەمێكی یەك لە دوای یەك لەو چەمكو بەهایانەی لە هۆو دەزگاكانی ڕاگەیاندنەوە پێمان دەگەن، كە وەك ئەو كوتانە وایە كە بە هۆیەوە توانای میكرۆبەكان لەسەر جەستەی مرۆڤ كەم دەكرێتەوە، گەر بە تەواویش بنەبڕنەكرێن.

بۆ نموونە زۆر دووبارە بوونەوەی وێنەو دیمەنی تاوانو توندوتیژی و ئافرەتو جنس، حاڵەتێكی بێ باكی (بێ موبالاتی) لامان دروست دەكات لە هەمبەریاندا، ئەگەر لە

---

[1] سوود وەرگیراوە لە: د. محمد بن عبدالرحمن الحضیف: كیف تؤثر وسائل الاعلام؟ دراسة في النظريات و الاساليب, مكتبة العبيكان, الطبعة الثانية, الرياض, ١٤١٩ هـ ـ ١٩٩٨ م .

سۆنگەی خۆراك پێدان، یان کوتانی خۆپارێزییەوە سەیر بکەین، دەبینین کوتانی پزیشکی لە نەخۆشییەکان دەمانپارێزێ ـ بە ویستی خودا ـ بەڵام کوتانی ئیعلامی بێباکی لامان دروست ئەکات و بە رۆیشتنی کات حاڵەتێکی وا بە دی دێنێ کە سەیرکردنی دیمەنگەلێکی نادروستو دوور لە دابو نەریتی کۆمەڵگا کە لە دەزگاکانی راگەیاندنەوە پەخش دەکرێن، لامان ئاسایی بێت، وەك ئەو دیمەنانەی رۆژانە کەناڵە ئاسمانییەکانو چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی ناوخۆش لە تێکەڵاویو رووتو قوتی ئافرەتو سەماو بێبەندو باری، پەخش دەبنو هانی سێکسو تێکەڵاوی ناشەرعی ئەدەنو بانگەشەی بۆ دەکەن، بێ هیچ گوێدانە باری کۆمەڵگاو ئایینو دابو نەریتەکانیو ئاسەوارەکانی لەسەر منداڵو هەرزەکارو ژنو پیاوی وڵات، بەڵکو گەر کەسێك ئەم دیاردەیە ئینکار بکاتو بەخراپ لە قەڵەمی بدات، بە بیرتەسكو توندڕەو ناوزەد دەکرێ، بەڕاستی وەك ئەوەی لێهاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ کردووە کە (کاری باشو شەرعی دەبێتە خراپو شتی ناشەرعیو خراپیش دەبێتە باشو پەسەند!).

**٤ـ تیۆری کارتێکردن بە دوو قۆناغ ـ Two Step Flow Theory:**

ئەم تیۆرە وای دەبینێ کە گاریگەری دەزگاکانی راگەیاندن لەسەر خەڵکی ناڕاستەوخۆو بە دوو قۆناغدا تێپەڕدەبێت، قۆناغی یەکەم بریتییە لە گواستنەوەی زانیارییەکان لە دەزگاکانی راگەیاندنەوە بۆ جەماوەرو بەشێوەیەکی راستەوخۆ کە رەنگە زۆر کاریگەر نەبێت لەسەریانو جێی بایەخیان نەبێت، بەڵکو بە خێرایی گوزەر دەکاتو لێرەوەش قۆناغی یەکەم کۆتایی دێت، قۆناغی دووەم دەست پێدەکات، ئەویش بریتییە لەوە کە ڕێبەرانی ڕاو خەڵکی دەستەبژێر (نوخبە)ی کۆمەڵگا کە ئەوانیش بینەرو بیسەر یان خوێنەری ئەو شتانە بوونە کە جەماوەر بینیونیو بیستوونی لە کەناڵەکانەوە، دێن ئەو ڕاو زانیارییانە باس دەکەنەوەو بەپێی گۆشەنیگاو تێڕوانینی تایبەتی خۆیان راڤەیان دەکەنو کاردەکەنە سەر خەڵکانی قۆناغی یەکەم بەڕادەو بە پێی هەبوونی دەسەڵاتی ماددی یان مەعنەوی لەسەریان، بڕواو بایەخو قەناعەتیان بەو زانیارییانە و قبوڵکردنیان لا دروست دەکەن.

**٥ـ تیۆری دیاری کردنی ئەرکە لە پێشینەکان (ئەولەویات)Agende –Setting:**

بیرۆکەی ئەم تیۆرە لە کارنامەی کۆڕو کۆبوونەوەکان وەرگیراوە کە بە (ئەجندە) ناودەبرێت، واتە هەروەك چۆن لە هەر کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا خشتەی ئەو بابەتانە دادەنرێتو لەبەر گرنگیو بایەخیان گفتوگۆیان لەسەر دەکرێت، ئاوەهاش میدیاکانی راگەیاندن

هەڵدەستن بە دانانی ئەجندە، یان بەرنامەی کاری خۆیان و ئەولەویاتی کارو پرۆگرامەکانیان، بە پێی گرنگی و گرنگتر دیاری دەکەن بۆ زیاتر کاریگەری دروستکردن لەسەر جەماوەر.

**٦ـ تیۆری پاسەوانی دەرگا یاخود دەرگاوان Gate – Keeper Theory -:**

بیرۆکەی ئەم تیۆرە لە کاری پاسەوانەوە هاتووە کە لەسەر دەرگا دەوەستیّو رێگە بە خەڵکانێك دەدات بچنە ژوورەوەو کەسانێکیش رێگە پێنادات، ئەمەش بە ومانایە دێت کە ستاڤی کەناڵەکانی راگەیاندن کۆنترۆڵی ئەو بابەتانە دەکەن کە دەیانەوێت بگەنە جەماوەر، واتە بابای رۆژنامەوان یان راگەیاندنکار وەك پاسەوانێك لە (دەروازەی جەماوەر) دەوەستیّو تەنیا رێگە بەو شتانە دەات پێیان بگاتو جێی بایەخیان بێت کە خۆی دەیەوێت و بەو شێوەو تەعبیرەش گەرەکیەتی، بۆ نموونە سەرنووسەرێك لە رۆژنامەیەکدا، خۆی بڕیار دەدات لەسەر بڵاوکردنەوەی هەواڵێك لە بارەی پێشبڕکێی (شاجوانان) لە ئەستەمبۆڵ، لە هەمانکاتدا رێگە دەگریّ لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی بڵاوبوونەوەو پەرەسەندنی دیاردەی حیجاب لە تورکیا.

بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن خاوەن بڕیارە لە نمایشکردنی زنجیرە درامایەکی تەلەفزیۆنی کە رەنگە زیانی لە قازانج زیاتر بێت، یان بەرنامەیەکی زانستی لەبری ئەوە دابەزێنیّ. هەروەها بێژەرەکە دەتوانیّ بێژیّ بە جەماوەر ـ وەك لە میدیاکانی بیانی، یان ئاژانسەکانی دەنگوباسی وەرگرتووە ـ ئەوەی لە فەلەستین روودەدات ململانێی نێوان حکومەتی ئیسرائیلو چەکدارە یاخیبووەکانی فەلەستینە، یاخود ئەوەی لە کشمیر روودەدات ململانێی نێوان حکومەتی هیندیو جودایی خوازەکانی کشمیرە، هەروەك هەمان بێژەر ئەتوانیّ بەم شێوەیە هەواڵەکە دابڕێژێتەوە (جیهادو بەرەنگاری فەلەستینییەکان دژ بە هێزەکانی داگیرکەری ئیسرائیل)، (شەڕو پێکدادانی کشمیرییەکان لەگەڵ حکومەتی هیندیدا لە پێناو سەربەخۆییو بەدەستهێنانی مافی چارەنووس)، یاخود کەناڵێکی راگەیاندنی دەرەوە دەتوانیّ شۆڕشی رزگاریخوازی کوردو خەباتەکەی بە (جەنگی نێوان حکومەتو یاخیبووە کوردەکان) لە قەڵەم بداتو دەیشتوانیّ ناوی بەریّ بە (شەڕی کوردەکان، یان شۆڕشگێڕە کوردەکان لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا لە پێناو بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، یان مافی وەدەستهێنانی چارەنووس)دا.

**٧ـ تیۆری بەکارهێنانو تێرکردن ـ usesand gratifcation Theory:**

ئەم تیۆرە بە پێچەوانەی تیۆرەکانی تری پێشوو، هەوڵدەدات بەشێوەیەکی جیا بڕوانێتە پەیوەندی نێوان هۆکانی ڕاگەیاندنو جەماوەر، بەپێی ئەم تیۆرە ئەوە هۆکانی ڕاگەیاندنو میدیاکان نین پەیامەکان بۆ جەماوەر دیاری دەکەن، بەڵکو ئەوەی تاڕادەیەکی زۆر ڕۆڵ دەبینێت لەو بەستێنەداو لە دیاریکردنی ناوەڕۆکی پەیامەکانی ئەو کەناڵو دامودەزگایانە، بەکارهێنانی جەماوەرە بۆ ئەو پەیامانەو جۆری پەیامو پڕۆگرامەکان بۆ تێرکردنی ئارەزوو و خواستەکانیان، واتە ئەم تیۆرە سەرچاوەی لە چەمکی باوی نێو زانستی پێوەندیکردن وەرگرتووە کە بە پرەنسیپی (ڕووبەڕووبوونی ئارەزوومەندانە) ناسراوە، یانی مرۆڤ سەرپشکە لە وەرگرتنی زانیارییەکان لەهەر سەرچاوەیەکەوە بێت کە لێرەدا مەبەست پێی (کەناڵی ئیعلامی)یە کە وەڵامگۆی داخوازیەکانیەتی و لەگەڵ جۆری تێڕوانینو بیرکردنەوەیدا دەگونجێ.

بەڵام چونکە تیۆری سەرەوە لە خۆرئاوا و بە تایبەتی لە ئەمریکا سەری هەڵداوە، کاریگەریشە بەکەشو هەوای لیبراڵیو دۆخی ئازادی ئەوێ، ئەو فەلسەفەیەش کە ڕاگەیاندنی خۆرئاوای لەسەر دامەزراوە بریتییە لە دەستخستنی زیاتری سامانو بەرژەوەندی ماددی بێ ڕەچاوکردنی هیچ ڕێسایەکی ڕەوشتی، کەوابوو ئەم چەمکە ئارەزوومەندانەییەی تیۆری (بەکارهێنانو تێرکردن)ی لەسەر وەستاوە، بۆ کۆمەڵگایەك کە ڕێگە بە نمایشکردنی هەموو شتێك دەدات لە توندوتیژیو تاوانو ئیباحیەتو شەڕواڵ پیسی (**الشذوذ الجنسي**) بە ناوی ئازادی بیروڕاو ئازادی بەیان، شتێکی مەنتیقیو ئاساییە، بەڵام بۆ کۆمەڵگایەك کە بەهای ڕەوشتی لای زۆر بە نرخە، ئاسایی نییە نمایشکردن و پیشاندانی هەرچی فیلمو وێنە و دیمەنێك هەیە لە جۆرەها هەڵسوکەوتی نەشازو نەشایەدو نەبایەد لە نموونەی تاوانی دەستدرێژیکردنی ناموس، تاوانی ڕێکخراوو، سەرقاڵکردنی گەنجو لاوان بە ڕابواردنو نغرۆ کردنیان لە خەیاڵاتی دەستبازیو ڕاوکردنی ئافرەت، و مژینی خوێنی مرۆڤو گۆشت خواردنیان و پێشێلکردنی مافو کەسایەتییان، و زامدارکردنی هەستو نەستیان، لە پێناو بەسەریەکەوەنانی سەروەتو سامانو ئامانجگەلێکی بۆشو بێسوود.

### ب . جۆرەکانی کاریگەریی:

گرنگترین ئەو کاریگەرییانەی میدیاکانی راگەیاندن لەسەر مرۆڤ دروستیان دەکات بریتین لە مانەی خوارەوە:

### ١ـ گۆڕینی هەڵوێست یان ئاڕاستە ـ Attitude change:

مەبەست بە هەڵوێست تێڕوانینی مرۆڤە بۆ مەسەلەیەك یان کەسێك‌و هەست‌و بیرکردنەوەی لەبەرامبەریدا .

هۆکانی راگەیاندن دەتوانن لە میانەی ئەو پەیام‌و پرۆگرامانەی پەخشی دەکەن، تێڕوانینی مرۆڤ بەرامبەر ئەوەی لەدەوروبەریدا روودەدات، بیگۆڕن لەمیانی گۆڕینی هەڵوێستیان‌و سەرەنجام حوکمدانیان لەسەری بەو شێوەیەی میدیاکان ویستوویانە، بۆ نموونە گۆڕینی هەڵوێستی گەلێك بەرامبەر گەلێکی تر لە خۆشەویستی‌و دۆستایەتییەوە بۆ رق‌و دوژمنایەتی، بەهۆی رۆڵی نێگەتیڤی کەناڵە رەسمییەکانی دەوڵەتەکەو بەخراپ بەکارهێنانی دژ بە گەلی دەوڵەتێکی تر کە لە ئاکامیدا رای گشتی بە ئاڕاستەی دوژمنایەتی ئەو گەلە دەوروژێنێ، لە کاتێکدا ئەو دوو گەلە هیچ گرفتێکیان لەگەڵ یەکتردانییەو تەنها دوژمنایەتییەکە لە نێوان دوو حکومەتی ئەو دوو وڵاتە دایەو بەس.

یاخود ئەوەی میدیا راگەیاندنەکانی ئەمڕۆ بە تایبەت لە خۆرئاوا پێی هەڵدەستن لەناشیرینکردنی رووخساری مسوڵمانان‌و ئایینی ئیسلام‌و تەنانەت خۆرهەڵاتییەکان‌و ژیارو شارستانییەتیشیان.

### ٢ـ گۆڕینی مەعریفی ـ Cogntive change:

مەعریفە بە مانای کۆی ئەو زانیارییانەی لای مرۆڤ هەیە بە مەسەلەی باوەڕو هەڵوێست‌و بیروڕاو هەڵسوکەوت، لە جۆری یەکەم (هەڵوێست، یان ئاڕاستە) گشتگیرترەو شوێن دانانیشی لەسەر ژیانی مرۆڤ پترە .

هۆکانی راگەیاندن کارتێکردنیان زۆرترە لەسەر گۆڕینی پێکهاتەی مەعریفی تاکەکان لە میانی پرۆسەیەکی درێژخایەن کە دەخوازرێ مەعریفەیەکی نوێ جێی مەعریفە کۆنەکەیان بگرێتەوە. ئەمە زنجیرە درامایەکی تەلەفزیۆنییە پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەت لە میانەی تێڕوانینێکی (هاوچەرخانە) وێنا دەکات!، ئەمەش وتارێکە چیرۆکی کچێك دەگێڕێتەوە کە بەسەر بارودۆخیا زاڵ بووە، کە لە داب‌و نەریت هەڵگەڕاوەتەوەو کۆت‌و بەندەکانی

شکاندووەو بە تەنیا سەفەری ئەمریکای کردووەو بەباڵاترین بڕوانامەوە گەڕاوەتەوە، پاشان هەواڵێکی تر پەخش دەکرێ لە بارەی (دەسکەوت)ێکی ژنانە، ئەویش بە دەستخستنی مەدالیای زێڕینە لە لایەن ئافرەتانی ئەڵمانییەوە لەپێشبڕکێی بڕینی مەودای کورتو مەلەوانی ئازاد، لە کاتێکدا پیاوان هیچیان بە دەست نەهێنا!! بەم شێوەیە دەبینین هەموو ئەو شتانە لە دانانی ژنو وێناکردنی بەچەشنێکی هاوچەرخانە و یاخیبوونی لە داب‌ونەریت‌و سەرکەوتنی بەسەر پیاواندا.. چوارچێوەیەکی نوێیان پێکهێناوە بۆ وەی هێدی هێدی شوێنی مەعریفە کۆنەکە بگرێتەوە.

### ٣ـ پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ـ Socialozation:

کۆمەڵناسانو پسپۆڕانی بواری پەروردە یەکدەنگن لەسەرئەوە کە لە هەر کۆمەڵگایەکدا چەند دامودەزگایەکی دیاریکراو هەن بە ئەرکی پێگەیاندنی تاکەکان و ڕۆشنبیرکردنو فێرە رەوشتو هەڵسوکەوتکردنی باشو گونجاو لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی هەڵدەستن، لەگەڵ فێرکردنیان و ڕۆشنبیرکردنیان لەباری بیروباوەڕو مەعریفەگەلێك کە ناسنامەی ڕۆشنبیریو ژیارییان پێکدێنێت، لەو دەزگاو دامەزراوانە: قوتابخانەو ماڵو ناوەندە ئایینییەکان کە لە کۆمەڵگاکانی لای خۆمان بریتییە لە مزگەوت، کە تا زەمەنێکی زۆر خەڵکی بەسەرچاوەی زانیاری خۆیان زانیونو ڕۆڵیان بەرچاو بووە لە پێگەیاندنی تاکەکانی کۆمەڵگادا.

پاش ئەوەی کە چاخی هۆکانی راگەیاندنو پێشکەوتنیان هات کە کەناڵی پێوەندی کردن بە جەماوەرەوە پێی نایە قۆناغێکی ترسناکەوەو هۆکانی راگەیاندن چیتر وەك بەشدارێکی بچووك لە پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتیی دا نەماوەتەوە، بەڵکو یاریکەرێکی سەرەکییە لەو پرۆسەیەدا، ئەوەتا راگەیاندن چۆتە گشت ماڵێکەوەو لەگەڵ گەورەو بچووكو ژنو پیاوو هەموو کەسێکدا دەدوێتو پەلاماری هەموو بوارێکی فیکریو ڕۆشنبیریو تاد.. داوە، کار لەسەر ژیریو هەستو نەستی مرۆڤەکان دەکات، لەبەرامبەریشدا، مرۆڤ خۆی داوەتە دەست ئەو کەناڵە میدیایانە و مناڵەکانی تەسلیم بەو (مامۆستا ئەلیکترۆنی)یە کردووە کە تاڕاددەیەکی زۆر ڕۆڵی باوك و دایكو قوتابخانە دەبینێتو زۆر جاریش ڕۆڵی ئەو زانایە دەبینێ کە فتوای لێوەردەگیرێ.

### ٤ـ وروژاندنی بە کۆمەڵ ـ Collectiive Reaction:

لە هەندێ کاتی دیاریکراوو لە بۆنەکاندا، هۆکانی راگەیاندنو میدیاکان بۆ جووڵاندنی جەماوەرو تەکان پێدانیان لە بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو، بەکاردەبرێن، هەندێجار

ئەو كارە سلبییەو هەندێجاریش ئیجابییە، بۆ نموونە لە كاتی جەنگ‌و هەڵگیرسانی شەڕدا، دەوڵەتەكان هەستی نیشتیمانی‌و میللیی، یان ئایینی گەلەكانیان دەوروژێنن بۆ ئاڕاستەكردنیان بەرەو ئەو ئامانجەی وڵاتەكەیان لە پێناویا دەجەنگێ، كە ئەمە پێی دەوترێت وروژاندنی بە كۆمەڵ، ئەم پرۆسەیەش دەكرێ لە هەر وەختێكدا روو بدات، بەڵام لە هەمووی سەركەوتووتر ئەوەیە لە كاتی قەیران‌و كارەساتەكاندا بێت وەك بوومەلەرزەو باوبۆران‌و نەخۆشییەكان‌و شەڕ.

**٥- وروژاندنی سۆزەكان - Emotional Responses:**

هۆكانی ڕاگەیاندن بە شێوەیەكی سەرسوڕهێنەر دەتوانن كاریگەری دابنێن لە سەر سۆزی مرۆڤ لە میانی بە كارهێنانی چەندین شێوازی نمایشكردن و پیشاندانی دیمەنی جۆرا و جۆر, بۆ نموونە ڕاگەیاندن دەتوانێ سۆزمان بجوولێنێ و ببینە هاوبەش و هاوسۆز لە گەڵ ئەو كەسەدا كە تاوانی دژ ئەنجام دەدرێ و قوربانی ستەمە دژ بە ستەم كار و تاوانبار و بۆی بگرین كاتێك دیمەنی مەینەتی و ئێش و ئازارەكانی دەبینین.

هەندێجار, ئەم سۆز وروژاندنە ئاراستەیەكی خراپ بەڵكو ترسناك بە خۆوە دەگرێ, ئەمەش كاتێك كە دەزگا و كەناڵەكانی ڕاگەیاندن سوود لە بەكارهێنانی زانیاری درۆ و نادروست وەردەگرن, وەك ئەوە كە هەندێ زانیاری نادروستمان پێبدەن و وادارمان بكەن كەسێك یان كۆمەڵێك یان لایەنێكمان خۆش بوێت یان ڕقمان لێی ببێتەوە یاخود خۆشحاڵ بین یان ناڕەحەت بۆی كە ناشێ خۆشمان بوێت یان پێی دڵخۆش بین, وە یان ڕقمان لەوی تریان ببێتەوە و دژایەتی بكەین.

جاری واش هەیە, میدیاكانی ڕاگەیاندن بە ئامانجی چەواشە كردنی جەماوەر و ڕوو وەرچەرخاندنی لە مەسەلەیەكی گرنگتر و ترسناكتر, سۆزی خەڵكی دەجولێنن، هەروەك چۆن لە مانگی یۆلیۆی ساڵی ١٩٩٣ ز, كەناڵە ڕاگەیاندنەكانی خۆرئاوا كاریان لە سەر وروژاندنی هەست و سۆزی خەڵكی جیهان كرد لە مەڕ ئەو مندالە بۆسنییە مسوڵمانەی كە بەهۆی بۆردومانی سڕبەكانەوە بۆ شاری (سەرایڤۆ) بە خەستی بریندار ببوو و بۆ چارەسەر كردن گواسترا بوویەوە شاری (لەندەن), زیاتر لە هەفتەیەك میدیاكانی ڕاگەیاندن بایەخیان بە پرسی ئەو مندالە كە ناوی (ئێرما) بوو دا و سۆزی جەماوەرێكی زۆری دنیایان بۆی ڕاكێشا و پەرۆشی و پەژارەی خۆیانیان بۆی دەربڕی, تا ئێرە شتێكی ئاساییە.

بەڵام ئەوەی راگەیاندنەکان خۆیان لەقەرەی نەداو رووی خەڵکی جیهانیان لیٚ وەرچەخاند, کارەساتیٚکی گەورەتر لەو پرسەی (ئیٚرما) بوو، کە بریتی بوو لە قەسابخانەی مسوڵمانەکان لە بۆسنە و هیٚرسك، کە سرپە دڕندەکان بە دەست خۆشی لیٚکردنی خۆرئاوا خۆی ئەنجامیان دا و هەزاران کەسی سڤیل و بیٚتاوان بە بەرچاوی هەموو جیهانەوە بوونە قوربانی!

## ٦ ـ کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتی ـ Social Control :

کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتی, بریتییە لەو (دەسەڵاتە) نەبینراوە کە مرۆ حسابی بۆ دەکات کاتیٚ لەو کۆمەڵگەیەدا هەڵسوکەوت دەکات کەتیایدا دەژیت، بۆ نموونە وەختیٚك هاووڵاتیەك مامەڵەیەکی دروست و تەریب لەگەڵ ریٚسا و یاسای وڵاتدا ئەکات ـ ڕازی بیٚ یان نا لەو یاسایەـ, ئەمە حەلیٚك کە پۆلیس و ئاسایش لەبەرچاویش نییە, پیٚی دەوتریٚت کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی.

دەزگا ڕاگەیاندنەکان دەتوانن ڕۆڵیٚکی بەرچاو لە پرۆسەی کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتیدا ببینن, ئەمەش لە مەسەلەی یەکخستنی جەماوەر لە سەر یەك کلتوری هاوبەش زیٚتر نمایانە, بۆ نموونە بوونی هەندیٚ دیاردەی وەك بیٚبەند و باری و تیٚکەڵاوی ژن و پیاو و ڕەشبەڵەك و نمایش کردنی ئافرەت و ڕووت کردنەوەی و سەما کردنی لە tv کانەوە, تا چەند ساڵیٚك لە مەو بەر بە کاریٚکی ناپەسەند و دوور لە داب و نەریت و شەرم و شکۆ و کەرامەتی مرۆڤی کورد دەهاتە ئەژمار, بەڵام ئیٚستا لە گەڵ تەشەنە کردنی میدیاکان و بارگاوی بوونیان بە مۆدیٚل و بەهاگەلی بیٚگانە, ئەم دیاردە نامۆیانە خەریکە بن بە شتیٚکی ئاسایی و بە شیٚك لە کلتور و دابی هەندیٚ ـ تویٚژی کۆمەڵایەتی بەلانی کەمەوە ـ و بەشیٚك لە پرۆسەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی و لەگەڵ ڕۆشتنی, بیٚ لەبەرچاو گرتنی ئاسەوارە نەریٚنی یەکانی لە سەر داهاتووی کۆمەڵگەکەمان.

## ٧ ـ دارشتنەوەی واقیع ـ Defining Reality :

مەبەست لە داڕشتنەوەی واقیع ئەو لایەنەیە کە هۆکانی ڕاگەیاندن بڵاوی دەکەنەوە یان پیشانی خەڵکی دەدەن لە هەر بواریٚکی کۆمەڵایەتی, ئابووری, سیاسی کۆمەڵگەدا بیٚت, بەشیٚوەیەك کەوا ویٚنا دەکریٚت ئەمە ڕووی ڕاستییەکەیەتی و گوزارشت لە حەقیقەت و واقیع دەکات.

نموونەی ئەمەش لەوەدا دەردەکەویٚت کە میدیاکانی ڕاگەیاندن, بۆ ویٚنە لە تەلەفزیۆنەکانەوە, ناوچەیەکی بچووك یان گەڕەکیٚك کە خانووی باش و ئاپارتمانی نویٚ و

پێشکەوتووی تیادا دروست کرا بێت و خزمەتگوزاری بۆ چوو بێت, پیشانی خەڵك دەدرێت, ئەم وێناکردنە زەینییە image کە (والتر لیبمان) ساڵی( ١٩٢٢ز) لێی دواوە, وەك نمایشکردنی خاڵێکی سپی وایە لە وێنەیەکی گەورەدا کە شاراوەیە لەجەماوەر، واتە کۆمەڵگە کە بە شێوەیەکی بەرچاو هەژارو دواکەوتووەو بێبەشە لە خزمەتگوزاریو بایەخپێدان.

نموونەیەکی تر، ئەو واقیعە نادروستە بوو کە دەزگا ئیعلامییە عەرەبییەکان، لە بارەی سوپا سەربازییەکانی وڵاتە عەرەبییەکان دایان دەرشتو بەزەبەلاحو بەهێزو لەشکان نەهاتوویان وێنا دەکردن، پێش ئەوەی شەڕی ساڵی ١٩٦٧ رووبدات، کەچی کە شەڕەکە هەڵگیرسا، ئەو سوپایانە نەیانتوانی زیاد لە شەش رۆژ لە بەرامبەر سوپای ئیسرائیل دا خۆیان رابگرن، بەمەش جەماوەری عەرەبیو جیهان بە گشتی بۆی دەرکەوت کە ئەو واقیعەی راگەیاندنەکان وێنایان کردبوو لە بارەی سوپا عەرەبییەکانەوە واقیعێکی نادروست و دوور لە راستی بوو.

**٨ـ سەپاندنی ئەمری واقیع ـ Endorsement of Dominant Idelogy:**

ئەمەش بەوە دەبێ کە هۆکانی راگەیاندن جەخت لەسەر سەپاندنی ئەو واقیعە بکەن کە بوونی هەیەو کۆمەڵێك بەپەسندی دەزانن، وەك بایەخدانی زێتر بە وەرزش (وەك نموومە) و جەخت لەسەر کردنی لەسەر حسابی هەندێ چالاکیو پرسی گرنگی تر لە کۆمەڵگەدا.

یان ئەو تەغتییە ئیعلامییەی بۆ هەندێ کەسو سەرکردە یان لایەن دەکرێ نەك لە بەرئەوەی هێندە جێی گرنگیو بایەخپێدانبن، بەڵکو، چونکە راگەیاندن ئەو واقیعە دەسەپێنێ و دەیکاتە بەرجەستە، لە هەمان کاتدا تەعتیمی ئیعلامی دەخرێتە سەر خەڵکان و لایەنانێکی تر، بەهۆی بوونی سیاسەتی چینایەتی کۆمەڵایەتیو ئەو سیاسەتەی حکومەت، یان لایەنو کەسانێك پێڕەوی دەکەنو دەزگاو میدیا راگەیاندنەکانیش بەشدارییی لە تۆخ کردنەوەو سەپاندنیدا دەکەن.

### ج . مەرجەکانی کاریگەریی :

کاریگەریی کەناڵو دەزگاکانی راگەیاندن لە سەر جەماوەری خەڵكو کارتێکردنیان بەندە بە بوونی چەند مەرجو هۆکارێك کە زەمینەسازی دەکەن بۆ ئەوەی پەیامەکانی راگەیاندن

کاریگەریی دروست بکەن، ئێمە لێرەدا بە کورتی و بەم شێوەیەی خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەین:

* ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە سەرچاوەی پەیامی راگەیاندنەوە هەیە:

**یەکەم: پسپۆڕیو شارەزایی سەرچاوەکە:**

بۆ ئەوەی پەیامو پرۆگرامەکانی راگەیاندن، سەرنجی (وەرگر) رابکێشنو کاری تێبکەن، پێویستە کەناڵ، یان سەرچاوەی پەیامەکان شارەزاییو پسپۆڕی هەبێت لەو بابەتو پەیامانەی ئاڕاستەی جەماوەریان دەکات.

**دووەم: راستگۆیی:**

دەبێ سەرچاوەی پەیامو هەواڵ، راستگۆییو میسداقیەتی خۆی بسەلمێنێ لە میانی کارکردنی بەردەوامی دا، ئەو کاتەش هێزی کاریگەریی پتر دەبێ، بەپێچەوانەوە، گەر هۆکانی راگەیاندن بە شێوازێکی ئینتیقائی مامەڵەیان لەگەڵ پەیامی راگەیاندنو (هەواڵ) دا کرد کە پێچەوانەی ماناو مەبەستی ئەسڵی بەدەستەوە بدات لەسەر رێڕەوی (**فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ**) ئەو کاتە راستگۆیی لەدەست ئەدەنو کاریگەرییشیان کەم دەبێتەوە.

**سێیەم: دەزگای راگەیاندن (الوسیلة الاعلامیة):**

رادەی کاریگەریی هۆکانی راگەیاندن و میدیاکان بە پێی چەند فاکتەرێکەوە جیاوازی هەیە، بۆ نموونە تەلەفزیۆن لە پێشەوەی کەناڵەکانە لە رووی کاریگەرییەوە، تەنانەت بە (سندوقی سیحری) ناوزەد کراوە.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەسەر بەراوردکردنی راستگۆیی هەواڵی رۆژنامەکانو تەلەفزیۆنو رادی پشتبەستنی خەڵکی و گەڕانەوە بۆیان بۆ وەرگرتنی هەواڵو زانیاری، دەرکەوت رێژەکە بۆ تەلەفزیۆن ٧٦٪ بوو لە بەرامبەر ٢٤٪ بۆ رۆژنامەگەریی. لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا سەبارەت بە بەشداریی دەنگدەران لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٨٠و کاردانەوەکانی جەماوەر بەرامبەر میدیا جۆراوجۆرەکان وەك سەرچاوەی بەدەستخستنی زانیارییە سیاسییەکان، دەرکەوت ئەوانەی لێکۆڵینەوەکە گرتبوونییەوە، دەنگویاسی T.Vیان وەك باشترینو زۆرترینی سەرچاوەی بەسوود لە بواری زانیاریی سیاسیی دا هەڵبژاردبوو، هەرچی (تید ژۆن Ted -John)ە لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەمەڕ هەڵبژاردنەکانی ئەڵمانیای رۆژئاوا لە ساڵی ١٩٨٤ز، ئەوەی دەرخست کە دەنگدەران وەك

سەرچاوەیەکی بنەڕەتی بۆ زانیاری لەمەڕ پرۆسەی سیاسی پشتیان بە هەواڵو نوچەکانی تەلەفزیۆن بەستووە...[1]

**چوارەم: مۆنۆپۆڵکردنی هۆکانی راگەیاندن:**

مۆنۆپۆڵ (إحتکار) کردنی هۆکانی راگەیاندنو میدیاکان دەبێتە هۆی یەك لایەنی لە سەرچاوەی وەرگرتندا، ئەم تاکلایەنییە کە بە زۆری لە وڵاتانی ئێمەدا حکومەت راگەیاندن قۆرخ دەکات، کاریگەریی لەسەر هاووڵاتی دەبێت، چونکە فرە رەنگی و فرە جۆری لە راو سەرنجو تێڕوانین ناهێڵێ کە ئەشێ بەهۆیەوە تاك تێڕوانینێکی سەربەخۆو بێلایەن گەڵاڵە بکات لە میانی هەڵبژاردنیدا لە نێو چەند بژاردە (خیار)ێکدا.

* ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە ژینگەی کۆمەڵایەتییەوە هەیە:

**یەکەم: رۆڵی کەسانی خاوەن راو پێگە لە کۆمەڵگەدا:**

گەر کەسایەتییەکانو رێبەرانو ئەوانەی قسە رۆیشتووو خاوەن راو تەگبیرو ردێن سپین، شتێکیان پەسەند کرد لەو پەیامانەی میدیاکانی راگەیاندن بڵاوی دەکەنەوە یان نمایشی دەکەن، ئەمە کار لە خەڵکانێکی تر دەکات لە کۆمەڵگەدا و ئەو راو پەسەندکردنەیان قبوڵ دەکەن.

**دووەم: واقیعو بارودۆخی کۆمەڵگا:**

راگەیاندن گەر واقیعو حاڵەتی کۆمەڵگا ـ کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووریو .. ـ تیایدا رەنگبداتەوە، کاریگەریی دەبێت لەسەر جەماوەر، بە نموونە، هەژاریو بێکاری، یان نەبوونی دادپەروەری کۆمەڵایەتیو ستەم لە کۆمەڵگادا، باسکردنیان شوێن دادەنێ لەسەر خەڵكو سەدای باشو ئیجابی دەبێ لە نێویاندا.

* ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بە پەیامی راگەیاندنەوە هەیە:

لەم رووەشەوە پەیامو پڕۆگرامی راگەیاندن کاریگەریی لەسەر جەماوەر دەبێ گەر:

**یەکەم: پەیامی راگەیاندنەکە پەیوەندی بە مەسەلەیەکەوە هەبێ رای گشتی پێوە سەرقاڵ بێت**

ئەو پرسو بابەتانەی جێی بایەخی خەڵکینو رۆژانە تەفاعولیان لەگەڵدا دەکەنو قسەی رۆژن، وروژاندنو باسکردنیان لە کەناڵەکانی راگەیاندنەوە کارتێکردنی زۆری لەسەر جەماوەر

[1] دکتورة حنان یوسف، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٨.

دەبێت و بە گرنگی وەردەگرن، وەك مەسەلەكانی گرانی بازاڕو هەڵاوسان، ئەگەر كۆمەڵگا پێیانەوە دەتلایەوە، بەڵكو راگەیاندنەكان ئەوكاتەش كار لە خەڵك دەكەن كە گفتی چارەسەركردنی ئەو گرفتو قەیرانانەیان پێدەدەن، گەرچی لەوەشیانا سەركەوتوونەبن.

**دووەم: دووبارەكردنەوەی پەیامەكانی راگەیاندن:**

مرۆڤ كاریگەر دەبێت بە زانیارییەكان (پەیامەكانی راگەیاندن) لە میانی پرۆسەیەكدا كە لە چوار قۆناغ پێكدێت ئەوانیش: ناسینو شارەزابوون لە زانیارییەكە، راڤەو لێكدانەوەی، ئەزبەركردنو پاراستنی لە یادەوەری خۆیدا، پاشان گێڕانەوەی هەر كاتێك پێویستی پێی هەبوو.

ئەم پرۆسەیە كە پێی دەوترێت پرۆسەی (دەستخستنی زانیارییەكان) پەیوەستە بە سلوكێكی تری ئینسانی كە پێی دەڵێن (بەئاگاهاتنەوەی ئارەزوومەندانە ـ **الإنتباه الإختياري**)، واتە مرۆڤ ئازادە و بە ویستی خۆیەتی كە زانیارییەك و پەیامێك قبووڵ دەكاتو ئەویتر وەرناگرێ، ئەمەش چەند فاكتەرێك تیایدا رۆڵی هەیە، یەك لەوانە (دووبارەكردنەوە)یە، بۆیە دەبینین هۆكانی راگەیاندن ئەو لایەنەیان لە مرۆڤدا قۆستۆتەوە كە ریكلامو پڕوپاگەندەیە، ئەم دووبارە كردنەوەیە كاریگەریی زیاترو پتر مانەوەی مسۆگەرە لە یادەوەری مرۆڤدا.

**سێیەم: شێوازی گەیاندنو نمایشكردنی پەیامە ئیعلامییەكە:**

شێوازی گەیاندنی پرۆگرامەكانی راگەیاندن و وێناكردنی بابەتێكی جێی مەبەست بە نۆرەی خۆی رۆڵی زۆری هەیە لە دیاریكردنی ئاستی كاریگەری كە رەنگە پەیامەكە لەسەر وەرگر جێی بهێڵێ.

**چوارەم: شێوازی داڕشتنی پەیامە ئیعلامییەكە:**

ئەمەش بۆ خۆی فاكتەرێكی دیكەیە لەو فاكتەرانەی بەشداریی دەكەن لە دروستكردنی كاریگەریی پەیامی راگەیاندن لەسەر جەماوەر، چونكە ئەم هۆكارە، واتە داڕشتنی پەیامو پڕۆگرام لەگەڵ ئەقڵو فیكرو خەیاڵی مرۆڤدا دەئاخفێ.

* ئەو هۆكارانەی پەیوەندییان بە جەماوەروە هەیە:

**یەكەم: جۆری جەماوەرەكە:**

جۆرو سروشتی جەماوەر یەك لە گرنگترین ئەو هۆكارانەیە كە سروشتو قەبارەی كاریگەریی پەیامی راگەیاندن دیاری دەكات. مەسەلەن منداڵان زیاتر لە گەوران و تازەلاوو

و هەرزەکاران زێتر لە پێگەیشتوان دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە، هەروەك پیاوان لە ژنان جیاوازن لە چۆنیەتی وەرگرتنی پەیامێکی راگەیاندنی دیاری کراودا.

**دووەم: پێگەی کۆمەڵایەتی تاك:**

پێگەی کۆمەڵایەتی تاك لە نێو کۆمەڵگەیەکدا کاریگەریی هەیە لەسەر چۆنیەتی تەفاعول کردن لەگەڵیداو شوێن دانان لەسەری، بۆ نموونە ئەو توێژە یان ئەو هاووڵاتیانەی هەژارن یان داهاتیان کەمە، زێتر کاریگەر دەبن و پتر بایەخ بەو پەیامانەی راگەیاندن دەدەن کە پەیوەندییان بە نرخ و هەڵاوسانو ئەو هەواڵانەی باس لە بازاڕو باشکردنی ژیانو گوزەرانی ئەو توێژە دەکەن.

**سێیەم: بیروباوەڕەکانی جەماوەر:**

یانی تاوەکو پەیامی راگەیاندن لە بیروباوەڕی جەماوەر نزیكو یەکانگیر بێت، قبوڵکردنی و کارتێکردنی لەسەر زیاتر دەبێت، بە پێچەوانەشەوە کەمتر دەتوانێ کاریگەر بێ یاخود بە لاوازی و درەنگ تەئسیرو شوێن دادەنێ لەسەر جەماوەر.

**چوارەم: تێگەیشتنی وەرگر بۆ پەیامەکە:**

بە پێی تێگەیشتنی تاکەکانی کۆمەڵگا لە پەیامی راگەیاندن، هەڵوێستو حوکمدانیشیان لەسەری جۆراوجۆر دەبێو چوون یەك نابێت، پێکهاتەی فەرهەنگیو کلتوریو پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی، رۆڵو نەخشی هەیە لەسەر ئەو جیاوازیو حوکمدانە، بۆ نموونە باسکردنی پەیوەندی جنسی لە نێوان دوو کەسدا بە شێوەیەکی ئاشکراو بێپەردەو بە راشکاوی لە کەناڵێکی راگەیاندندا، دەشێ ئەو کەسەی لە کۆمەڵگایەکی غەیرە پارێزگاردا پێگەیشتبێ، بە شتێکی گوزەرو کەم ئەمیەت لە قەڵەمی بدات کە شایانی لەسەر وەستان نەبێت، لە حاڵێکدا بابایەکی پێگەیشتوو لە کۆمەڵگایەکی مولتەزیمو پارێزگار (**محافظ**)دا ئەمە بە بانگەشەیەکی خراپو بێبەندو باری لە قەڵەم بدات کە جێگای قبوڵ نییە.

**د . بوارەکانی کاریگەریی:**

سەرباری ئەوەی باسکرا لە شوێنەوارو کاریگەریی ئەو شتانەی دەزگاکانی راگەیاندن بڵاوی دەکەنەوە لە زانیاریو هەواڵی جۆراوجۆر لەسەر خەڵکی، بەڵام بەشی هەرە گەورە لە لێکۆڵینەوەکان لەم رووەوە پتر پێی داگرتووە لەسەر لێکۆڵینەوەو باسکردنی سێ بوار، کە ئەوانیش:

١ـ بواری پێگەیاندنو پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی: (**التنشئة الإجتماعية**).
٢ـ بواری توندوتیژی (**العنف**).
٣ـ بواری وروژاندنی سێکسی (**الإثارة الجنسية**).

ئەمەش واناگەیەنێت، توێژەرەوانی بواری راگەیاندنو کۆمەڵگە لایەنەکانی تری کاریگەری هۆکانی راگەیاندنیان لەسەر جەماوەر فەرامۆش کردووە، وەك گۆڕینی هەڵوێستەکانو کاریگەریی دروستکردن لەسەر راو بیروبۆچوونی خەڵکی و ئەو شتانەی تر کە پەیوەندی بە رەفتارو هەڵسوکەوتی مرۆڤەوە هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە ئەم سێ شتە یان بوارە، زیاد لە هەموو شتێکی تر جێی گوتو وێژو مشتو مڕن بە هۆی ئەو ئاسەوارە قووڵانەی لەسەر زۆر توێژو لایەنی ناو کۆمەڵگە بە تایبەتیش منداڵان، جێی دێڵن.

## رای گشتیو راگەیاندن

دەزگا راگەیاندنەکان بە گشتی ـ بینراوو بیستراوو خوێنراو ـ ئامانجیان تێگەیاندنو رۆشنبیرکردنی جەماوەرو گەڵاڵەکردنو گۆڕینی رای گشتییە بەشێوەیەك بگونجێت لەگەڵ ئامانجو بەرژەوەندییە گشتییەکاندا.

## چەمکی رای گشتی

رای گشتی بریتییە لە راوبۆچوونی ئەندامانی گروپێکی کۆمەڵایەتی سەبارەت بە مەسەلەیەکی دیاریکراو، یان بریتییە لە چەند ئاڕاستەو بڕاردەیەك کە چەندین کەسی کۆمەڵگا دەری دەبڕن لە مەڕ مەسەلەیەکی جێی بایەخی گشتی.[١]

(چایڵدز) دەڵێت رای گشتی بریتییە لە کۆمەڵێك راوبۆچوونی تاکەکان.

(البرج) پێی وایە رای گشتی دەربڕینی بابەتێکی دیاریکراوە، کە جێی وتووێژ بێ لەلای گروپێك لە گروپەکان.

(کی) پێناسەی رای گشتی ئاوا دەکات کە بریتییە لەو راوبۆچوونانەی دەبنە بیروباوەڕ لای خەڵکانێکی تایبەتو لەم رووەوە حکومەت بە هەندی وەردەگرێتو وریای دەبێت.[١]

---

[1] – **الدكتور قحطان أحمد سليمان الحمداني، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٥.**

زانا سۆسیۆلۆژییەکانی وەك (جۆن ستیوارت میل)و (کۆلێرنە)و (ولیام ئەلبێگ William Albig) و (لیۆنارد دۆب Leonard dob)و (ئۆلپۆرت R.H.Alport)و (ڤۆکەی V.O.Key)و (د. و. مینار D.W.Minar)، بە گشتی وای بۆ دەچن کە رای گشتی بریتییە لە گوزارشت کردن لە بابەتێك ، یان مەسەلەیەکی دیاریکراوو گرنگ لە لایەن کۆمەڵە کەسانێکی زۆرەوە لە ماوەیەکی زانراوو لە ژێر کاریگەرییێتی راگەیاندندا کە دوای دیالۆگو وتووێژو هەڵسەنگاندنێکی ئاشکرا گەڵاڵە دەبێت[٢]، بۆیە لەم سۆنگەیەوە دەتوانین بڵێین رەگەزەکانی رای گشتی بریتین لەمانەی خوارەوە:[٣]

١- بوونی گروپێکی دیاریکراو لە خەڵکی کە خاوەن پرسێکی دیاریکراو بن، ئیدی گروپەکە گەورە بێت، یان بچووك.

٢- بوونی ڕا، یان ئاڕاستەیەك بۆ ئەو مەسەلەیە بەڕازیبوون پێی یان رەتکردنەوەی کە بە شێوەی نووسین، یان بە زارەکی، یاخود بە دەست گوزارشتی لێ دەکرێ.

٣- بوونی مەسەلەیەکی دیاریکراو - گشتی بێت، یان تایبەتی - کە دەخوازرێ راوبۆچوونی لە هەمبەردا دەربڕدرێ.

٤- ئەو ڕاو ئاراستەیەی گوزارشتی لێدەکرێ هی زۆرینەی کۆمەڵ بێت.

٥- رایەکی کاتییە بۆ وەختێکی زەمەنی، و هەمیشەیی نییە.

لە روانگەی ئیسلامەوە رای گشتی بریتییە لە رای جەماوەری ئوممەت، واتە رای زۆرینەیان، بە مانای ئەگەر زۆربەی خەڵکی مسوڵمان راوشتێکیان بە پەسەند زانی لە هەر بوارێکی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتیی دا، ئەوا بە ڕای هەموو ئوممەت لەو مەسەلەیەدا دێتە هەژمار، لەگەڵ پێدانی بایەخی تایبەت بە نوخبەی رۆشنبیری کۆمەڵگە کە بریتین لە زاناو داناو فەقیهەکان کە ڕاو بۆچوونەکانیان حسابێکی تایبەتی بۆ دەکرێو سەنگی خۆی

---

[1] – سۆزان مامە: ڕای گشتی و ڕۆڵی ڕاگەیاندن, گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس)، سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ژمارە (٩), ٢٠٠٦، ل٧٩.

[2] – رەئوف حەسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.

[3] - الدکتور قحطان أحمد سلیمان الحمداني، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٥.

هەیە لە ڕێزدانان بۆ ئەو حوکمەی دەردەچێت لە کاتی بەڵگە پێهێنانەوە و ئیستیدلال کردن لە رای گشتییدا.[1]

## گرنگی ڕای گشتی

رای گشتی لە چەند رووەوە گرنگی هەیە، ئەمڕۆ هەڵوێستەکانی رای گشتی لە بەرامبەر مەسەلە سیاسییو کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکان ـ نیشتیمانیو هەرێمیو نێودەوڵەتی، بایەخو گرنگییەکی زۆری هەیە، بە تایبەت کە کار دەکاتە سەر گۆڕینی رەوتی کۆمەڵ بە ئاڕاستەی ئەو شتانە یان ئەو بیروباوەڕانەی هەر گەلو حکومەتێك یان گروپێك بۆ بەدەستهێنانی کۆمەڵێك مافی خۆی یان لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا پێی باشە. لە وشتانەی رای گشتی تیایدا بایەخی هەیە، زانینی راو گۆشەنیگای گشتییە لە بارەی پاڵێوراوانی هەڵبژاردنەکان، بۆ ئەو مەبەستەش بە چەند شێوازێك وەك راپرسی هەوڵدەدرێت لە پێشا ئاراستە و هەڵوێستەکانی ڕای گشتی بزانرێ, و سوود لە ئەنجامەکانی وەردەگیرێت بۆ ڕەنگرێژیی سیاسەت و نەخشە و پلانی داهاتوو.

دیارە ئەمەش وا ناگەیەنێت کە بە شێوەیەکی ڕەها پشت بە ڕای گشتی دەبەسترێت, چونکە وا رێك دەکەوێت سەرۆك و فەرمانڕەواکان دوای سەرکەوتنیان هەڵوێستی جیاواز وەردەگرن, یاخود لە ڕای زۆرینە لادەدەن و خۆشیان لەگەڵ رەخنە و گازەندەی توندی جەماوەر بەرەو ڕوو دەکەنەوە, دیارترین نموونە هەڵوێستی (تۆنی بلێر)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیایە کە خۆی گێل کرد لە بەرامبەر ڕای گشتی بەریتانی کە بەڕێژەیەکی زۆر (٦٨٪) دژی شەڕی عێرق بوو, لە لایەن حیزبەکەی خۆشیەوە (حیزبی کرێکارانی بەریتانی) ڕووبەڕووی دژاتییەکی توندبوویەوە کە خەریك بوو لە پلەکەی لای بەرێت.[2]کە ئەو هەر لە سەر ڕاکەی خۆی بەردەوام بوو و بایەخی نەدا بە ڕای گشتی وڵاتەکەی. هەمان نموونە بۆ ڕای گشتی ئەمرۆی ئەمریکاش دروستە, کە (جۆرج بۆش) لە هەمبەر شەڕ و کشانەوەی هێزەکانیان لە عێراق پشت گوێی خستووە.

---

[1] – موسی زید الکیلاني، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢ـ٤٣.

[2] - الدکتور قحطان أحمد سلیمان الحمداني، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٦.

ڕای گشتی وەك یەك لە هێزەكانی ژیانی سیاسی كۆمەڵگەی مەدەنی لە گۆڕانكاریە ئابوورییەكان و دبلۆماسیەتی گشتیدا گرنگی و بایەخی زۆری هەیە, هەروەك ڕای گشتی لە هەر مەسەلەیەكدا ڕادەی كارلێكی میللی و هەماهەنگی و هاوخەمی كۆمەڵایەتی و یەكبوونی بەرژەوەندی لەو مەسەلەیەدا و هەروا كارایی و زیندوویّتی كەناڵەكانی پێوەندی ڕای گشتی و كاریگەر بوون بە هۆكانی ڕاگەیاندن و قەناعەت كردن بە پەیام و ڕوونكردنەوەكانیان, دەردەخات.

گەرچی نە لە قورئانی پیرۆز و نە لە فەرموودەكانی پێغەمبەردا (ﷺ), وشەی(ڕای گشتی) بە چەمكە گشتییەكەی نەهاتووە, بەڵام ئیسلام وەك ئایین و هزری ئیسلامی وەك هزرێكی جیهانی, مانایەكی پڕ بایەخ و گەورەی داوە بە چەمكی ڕای گشتی لە میانی ڕوونكردنەوەی ئەو ئەرك و بەرپرسیارێتییانەی پێویستە دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوای مسوڵمانان لە بابەتی رای گشتی دا وەڵامگۆیان بێت.

ئیجماع لە شەریعەتی ئیسلامدا كە لەسەرچاوەكانی فەرمانڕەوایەتی و حوكمە و شوێنێكی تایبەتی و مەزنی هەیە, وا پێناسە دەكرێ كە بریتییە لە ڕای گشتی خاوەن ڕا و شەرع زانەكان لە ئاییندا. هەروەك عورفی دروست و ڕەسەنیش گرنگی خۆی هەیە كە بریتییە لەو شتانەی لەنێو خەڵكیدا باو بوونە و خوویان پێوە گرتوون و لەسەری ڕاهاتوون, كەوا بوو وەختێك هزری ئیسلامی ئەو بایەخە گەورەیە بە ئیجماع و عورفی ڕەسەن دەدات, واتای گرنگی دان بە ڕای گشتی دەگەیەنێ.

ئەم گرنگی پێدانەش بەڕای گشتی، ئیسلام بەر لە ١٤٠٠ ساڵ و بەر لەوەی ڤۆڵتر لیبمان كتێبەكەی لە بارەی ڕای گشتی لە ساڵی ١٩٢٢دا بنووسێ كە توێژینەوە نوێكانی بواری ڕاگەیاندن بە سەرەتای قسە لەسەركردنی رای گشتی دادەنێن، دەستی پێكردووە، بۆ نموونە پێغەمبەر (ﷺ) هێزی كاریگەری لە رای گشتییدا بەكارهێنا كاتێك فەرمانی بە مسوڵمانان كرد دەنگ دابڕن لەو سێ كەسەی لە جەنگی تەبوك دواكەوتبوون (كەعبی كوڕی مالیكو مەرارەی كوڕی ڕەبیعو هیلالی كوڕی ئومەییە)، كە ئەوەبوو بۆ ماوەی (٥٠) ڕۆژ دەنگیان لێ ڕاگرتنو موقاتەعەیان كردن، ئیتر كەوتنە ژێر فشاری رای گشتی ئەوكاتەو زۆر نارەحەت بوون، تا ئەوە كە پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە لای خوا، و خوداش تەوبەكەی قبوڵ كردنو هاتنەوە ریزی جەماوەر كە قورئانی پیرۆز لە ئایەتەكانی (١١٧ـ ١١٩)ی سورەتی (تەوبە)دا بۆمان ئەگێڕێتەوە.

هەروەها لە قۆناغەکانی تری حوکمڕانی ئیسلامیشدا، سوود لە رای گشتی وەرگیراوە، بەتایبەت لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لیٚ بیٚت) ئەو مەسەلەیە باشتر نمایانە، کە سوودی لە رای گشتی وەردەگرت لە پەیوەندییەکانی خۆیدا لەگەڵ والی ویلایەتەکاندا، گەر سکالاٚی ناوچەیەکی لەسەر والییەکان پیٚدەگەیشت، نویٚنەری خۆی دەنارد بۆ لایانو رای ناوخۆی ویلایەتەکەی وەردەگرت لەسەریو کاری لەسەر دەکرد هەروەك لەمەڕ خەڵکی کوفەدا وا مامەڵەی کرد.[١]

ئایینی ئیسلام هانمان دەدات ریٚز لە رای گشتی بگرین لەوەی کە جەماوەری مسوڵمانان و ئەهلی حەلو عەقد (شورا) لە کاروباری شەرعیو عورفییاندا لەسەری ریٚك دەکەون، چونکە یەك لە کۆڵەگەکانی رای گشتی ئیسلامی بریتییە لە پرەنسیپی راویٚژ (شورا) کە گردبوونەوەیەکی رای گشتییە (**وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ**).[٢]

واتە: لە کاردا راویٚژو تەگبیریان پیٚبکە، وەختیٚ لیٚبڕای و ئەزمت جەزم کرد کاریٚك بکەی، ئەوا هەر بە تەمای خوابە و پشت بەو ببەستە، بەڕاستی خودا ئەو کەسانەی خۆشدەویٚ کە پشت بەو دەبەستن.

هەروەك لە کۆڵەگەکانی رای گشتی، خۆشویستنی هاوولاٚتی ئیجابییە لە هاوولاٚتی بوونو قبوڵنەکردنی ستەم و ژیانی سەرشۆڕیو ژیٚردەستەییدا، وە لە سەربەخۆیی لەڕاو بۆچوونداو شویٚن نەکەوتنی کویٚرانە. جیٚی ئاماژەیە کە یەکیٚ تر لە کۆڵەگەکانی رای گشتی بریتییە لە شویٚنکەوتنی رای سەرۆكو سەرکردەی بالاٚ لە هەندیٚ حاڵەتدا باوەکو قەناعەتیشت نەبیٚ پیٚی، چونکە ئەو وردترو فراوانتر لەبەرژەوەندی گشتی مسوڵمانان دەڕوانیٚ، واتە ئەگەر سەرکردە شتیٚکی تری جیا لەوەی رای گشتی لەسەرە بە سوودبەخشتر و بەرژەوەندیتر بۆ مسوڵمانان و دانیشتوانی ولاٚت زانی، ئەوە هەڵدەبژیٚری، وەك دەبینین پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) لە (سوڵحی حودەیبیە)دا بڕیاری ئاشتی دا، گەرچی ژمارەیەکی زۆر لەگەڵیدا نەبوون لەوانەش (عومەری کوڕی خەتتاب)، کە ئەوەبوو دواتر لەبەرژەوەندی

---

[1] – موسى زيد الكيلاني، **هەمان سەرچاوەی پیٚشوو**، ل٤٠ـ ٤٢.

[2] – **سورەتی (ئالی عمران) ئایەتی (١٥٩).**

مسوڵمانان شکایەوەو ژمارەیان لە (١٤٠٠) کەسەوە بۆ (١٠) هەزار کەس زیادی کرد لە ماوەی دوو ساڵدا، ئەمەش ڕۆڵی سەرکردە لە گەلاڵەو دروستبوونی رای گشتییدا دەردەخات، بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە یەکەم: پێغەمبەر (ﷺ) بە پێی نیگاو پەیامی خوا هەڵسوکەوتی دەکرد، نەك لە خۆیەوە، دووەمیش: ئەمە بۆ سەرکردەیەك دەشێ و ڕەوایە بەڕاستی دادپەروەرو راستگۆو جێی متمانەی مسوڵمانان بێت، نەك خۆسەپێن بێتو پێشخستنی بەرژەوەندی تایبەتی لەسەر بەرژەوەندی گشتی سیماو پیشەی بێت.

## جۆرەکانی رای گشتی

١ـ رای گشتی ناوخۆیی.

٢ـ رای گشتی دەرەوە.

٣ـ رای گشتی توندوتیژ (شۆڕش، یا کودەتا).

٤ـ رای گشتی شاراوە (کە دەبێتە هۆی بێموبالاتی و نەرێنی).

٥ـ رای گشتی کاتی (لە کاتی شۆڕشەکاندا ـ پلانێکی سیاسی، بەرنامەیەکی مانگرتن).

٦ـ رای گشتی تێکڕایی (هەموو خەڵکی دەگرێتەوە لە جەماوەری گەل لە رووی مێژوویی‌و ژیاری دا کە ئەمە رایەکی گشتیی هەمیشەییە).[1]

## پێکهاتنی رای گشتی

رای گشتی لە کۆمەڵێك هۆکار پێکدێت ـ ناوخۆیی‌و دەرەکی ـ کە کاریگەریی دروست دەکەن لەسەر راو هەڵوێستو هەڵسوکەوتی جەماوەر، چ بە سلبی بێت، یان ئیجابی، لەوانە:

١ـ ژینگەو خێزان.

٢ـ ئایین‌و داب‌و نەریت.

٣ـ چەشنی چینایەتی‌و کۆمەلایەتی.

٤ـ جۆری کلتورو بیرکردنەوە.

٥ـ قوتابخانەو ماڵ.

---

[1] – موسى زيد الكيلاني، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٧٥

٦ـ هۆکانی راگەیاندن.
٧ـ رووداوە گرنگەکانو ئەزموونەکانی ژیاریی مرۆڤایەتی.
٨ـ حیزبە سیاسییەکانو گروپەکانی فشارو بەرژەوەندی.
٩ـ سەرکردایەتی.
١٠ـ بارودۆخەکان ئێستاو داهاتوو.[١]

## کاریگەریی راگەیاندن لە دروستبوونی رای گشتییدا

بێگومان هۆکانی راگەیاندنو میدیا، هۆکارگەلێکی گەورەن لە کاریگەریی دروستکردنی رای گشتییدا، بەتایبەت کە ئەمڕۆ هاوولاتیان بە بەردەوامی مامەڵەیان لەگەڵا دەکەنو زانیارییان لێوەردەگرن، کەناڵو میدیاکانی راگەیاندنیش کێبەرکێیانە بۆ راکێشانی جەماوەر بەلای خۆیاندا و دروستکردنی رای گشتی بەهەر وەسیلەیەکی گونجاو، هەروەك بانگەشەو ریکلام و جەنگی دەروونی و پڕوپاگەندەش، وێڕای هەواڵو زانیاریی لە خۆدەگرن.

کەناڵو هۆکانی راگەیاندن دەتوانن رۆڵێکی گەورە لە گەڵاڵە کردنی رای گشتییدا ببینن، هەروەك لە ڕابردوودا بینییان, وەك چۆن لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا کەناڵە تەلەفزیۆنیە جیهانیەکان, بە ناو خۆی ئەمریکاشەوە, بە شێوەیەکی بەربڵاو دەستیانکرد بە بڵاوکردنەوەی کوێرەوەرییەکانی شەڕی (ڤێتنام) و کارەساتەکانی و بەدڕەوشتیەکانی سوپای ئەمریکا و پێشێلکردنەکانی مافی مرۆڤ لەو جەنگەدا, کە ئەمریکا دەیەویست تەنها هەواڵی سەرکەوتنەکانی و رەوایی شەڕەکە پەخش ببێ, بەڵام ڕاگەیاندن توانی ڕای گشتی جیهانی دژی ئەمریکا بهەژێنێ بە هۆی ئەو هەواڵ و وێنە و دیمەنانەی لە شەڕەکەی ڤێتنامەوە بۆ خەڵکی جیهان پەخشی دەکرد, و پەردە هەڵماڵێن لەسەر قەیرانی تێوەگەلانی ئەمریکا لە شەڕەکەدا و ئەو بودجەیەی بە نهێنی بۆی تەرخان کرا بوو, تەنانەت بەهۆی بڵاو کردنەوەی هەواڵەکانی ئەو شەڕەوە, حکومەتی ئەمریکا ڕۆژنامەی (نیۆیۆرك تایمز)ی دا بە دادگا و سەرۆك کۆمار و وەزیری بەرگری ئەو وڵاتە سوور بوون لەسەر سزادانی, بەڵام بڕیاری دادگا پێچەوانەی داواکانیان بوو.[٢]

---

[1] - الدكتور قحطان أحمد سليمان الحمداني، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٢. موسى زيد الكيلاني، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧ـ ٥٨.

[2] – رەئوف حەسەن, سەرچاوەی پێشوو, ل ٥٥ ـ ٥٧.

هەروەك (ڕای گشتی) كاری خۆی دەكات, هەوڵەكانی (دژە ڕای گشتی)ش بەردەوام كاری جددی بۆ هەڵوەشاندنەوە و پووچەڵكردنەوەی دەكەن و هەرچەكی ڕاگەیاندنیش بۆ نەهێشتن یان كەم كردنەوەی كاریگەرێتی ڕای گشتی بەكار دەبرێ, بۆ نموونە لەكاتێكدا ڕای گشتی سەبارەت بە گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق لەسەردەمی (كلینتۆن)دا گەیشتە لوتكە "و هەر (٢٤) ئوسقوفیەتەكەی ئەمریكا, بەراپۆرتێك كوشتنی ڕۆژانەی (٢٥٠) منداڵی عێراقی بەرەفتارێكی بەدڕەوشتانە دایە قەڵەم, كتوپڕ ئابڕوو بردنە (**فضیحة**)ەكەی (مۆنیكا ـ گەیت)ی سێكسییان بۆ چەندەمین جار بەسەردا هێنا و لەنێوانیدا كێشە جینایەتكارەكەی خۆیان بەرامبەر (٢٠) ملیۆن ئینسان كپكردەوە".[1]

هەروەها لەكاتی كیمیابارانی شاری هەڵەبجە و ناوچەكانی تری كوردستان لە هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا كە خەریك بوو ڕای گشتی جیهانی بهەژێنێت, هەر زوو گەمارۆ درا و زلهێزەكان خۆیان لێ گێل كردو خەریك بوو گومانیش لە ڕاستی و دروستی هەواڵەكە دروست بكەن و دروستیشیان كرد, تەنیا ئێران وەك پێویست هاتە پێشەوە و ڕێگەی بەپەیامنێرەكان داو ڕاگەیاندنی خۆیشی خستەگەڕ بۆ گواستنەوەی واقیعی كارەساتی (هەڵەبجە), تا ئەو كاتەش ویستیان و بەرژەوەندییان خواستی, باسی نەكرایەوە!

لەكۆڕەوی ملیۆنی بەهاری (١٩٩١)شدا, ڕای گشتی و ویژدانی مرۆڤایەتی جوولا, كاتێك كەناڵەكانی ڕاگەیاندن و tv كان دیمەنەكانی كۆچی بە كۆمەڵی كوردان و ئێش و ئازار و مەرگەساتەكانیان پیشانی دنیادا كە بەرەو سنوورەكانی ئێران و توركیا ملیان نابوو لە ترسی ڕژێمی بەعس, بەڵام ئەو ڕای گشتییەش كرایە قوربانی دەست پێكردنەوەی وت و وێژی نێوان حكومەتی بەغداو سەرانی (بەرەی كوردستانی) و دەست لەملانێ بوونیان لەگەڵ (سەددام حوسێن)دا, كە زیاتر تیشك خرایە سەر ئەو مەسەلەیە و مەرگەساتەكانی كۆڕەوەكە بە فەرامۆشی سپێردران.

جا لەبەرئەو ڕۆڵەی ڕاگەیاندن لەژیانی گشتی ئەمڕۆی مرۆڤایەتیدا دەیبینێ, ئەستەمە هەروا تێپەڕاندنی و بە هەند وەر نەگرتنی, ئەندامانی بواری ڕاگەیاندنیش كە تاكی نێو كۆمەڵگەن, وەختێك دەكارن زیاتر كاریگەریی بنوێنن و ڕای گشتی ئیجابی گەڵاڵە بكەن كە

[1] – بە گواستنەوە لەسەرچاوەی پێشوو, ل ٥٧.

ڕاستگۆ بن و ئەمانەت لە گواستنەوەی زانیارییەکان و خستنەڕووی گرفت و ئاریشەکان و دانانی چارەسەر بۆیان, ڕەچاو بکەن.

## هەڵسەنگاندنی ڕای گشتی

دوای ئەم کورتە باسە لەمەڕ رای گشتی، پێمان خۆشە ئاماژە بەوە بدەین کە (ڕای گشتی)ش لەلایەن توێژەرەوانو بایەخ پێدەرانی ئەو بوارەوە، رووبەڕووی رەخنەگەلێك بووەتەوە،[1] کە وتوویانە: ئەم ڕایە نە (ڕا)یەو نە (گشتی)یە، چونکە راکان هی خەڵکانێکی کەمن کە بەرژەوەندییان وادەخوازێت، هەروا هی ئەو سەرکردەو فەرمانڕەوایانەی ئاڕاستەکەر و جووڵێنەرین، بەڵام تێکڕای میللەت، ئاگادارنییەو زۆربەیان حەقیقەتی شتەکان تێناگەن، بۆیە وەسف کردنی (ڕا)یەکە بە (گشتی) لەگەڵ واقیعدا یەك ناگرێتەوە، هەروەها (ڕا)ش نییە، چونکە پێویست دەکات (ڕا) زادەی چەندین زانیاری وردو تەواو بێت لەمەڕ مەسەلەیەکدا کە جێی باسو تاوتوێ کردنە بۆ گەیشتن بە ئاکامێکی دروستو هاوسەنگ، کەچی زۆربەی ئەوەی دەخرێتە بەرباس، ئەنجامی ئەو کاریگەرییەیە کە دەزگاکانی راگەیاندن دروستی دەکەن، یان ئەو بانگەشەیە کە زانیارییەکانی پێویستییان بە راستیو دروستیو دیققەت هەیە.

بۆیە پێویستە ڕای گشتی دروستو تەواو کە سەنگو قورسایی خۆی هەبێت، چەند مەرجێکی تیادا بێتە دی، وەك بوونی رادەیەکی پێویست لە تێگەیشتنو هۆشیاری لای تاکەکانی کۆمەڵگەو ئامادەباشی بۆ وەرگرتن یان رەتکردنەوەی ئەو ڕاوبۆچوونانەی پەیوەستن بە کاروباری گشتییەوە، وەهاوبەرژەوەندیو هاوڕەگەزییو یەکبوونی زمانو ئاینو ژینگەی گشتی، چونکە جیاوازی لەو شتانەدا لە ئەمیەتی رای گشتی کەم دەکاتەوە، ئەمە وێڕای بوونی ئازادی راو قسەو بەیان، و ساغی و ئەمانەتی میدیاکانی راگەیاندنو دوور بوون لە هەوڵدانی تاکڕەوانەو کارکردن بۆ لایەنێکی دیاری کراوو قۆرخ کردن.

ئەگەر لە سیستەمە دیموکراتییەکاندا، رای گشتی شوێنی خۆی هەبێو مەسەلەیکی دیارو بەرچاو بێت، ئەوا لە سیستەمە تۆتالیتارو بەناو دیموکراتییەکاندا، حیزبی دەسەڵاتدار لە

[1] – الدكتور قحطان أحمد سليمان الحمداني، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٨.

هەوڵی ئەوەدایە ئیرادەو بیروڕاکانی لە ڕێی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بەسەر ڕای گشتییدا بسەپێنێ بۆ ڕازی کردنی جەماوەر بە بیروبۆچوونەکانی، هەروەك چۆن سەرکردەکانی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی پێشوو بە ڕاشکاوانە ڕایانگەیاند کە نەك لە دوای جەماوەرەوە ناڕۆن، بەڵکو خۆیان لە سۆنگەی ئامانجەکانیانو بە هۆی ئامرازەکانیانەوە، ڕێبەرایەتی جەماوەر دەکەنو بە حیزبەوە پەیوەستی دەکەن، ئەگەر نا دووچاری مەرگو نەمان دەبنەوە لە حاڵەتێکا بێ فەرمانی حیزب بکەن، هەروەها زۆربەی ڕژێمە دەسەڵاتدارەکانی ئەمڕۆش بە تایبەت لە خۆرهەڵاتو ناوچەکەی ئێمەدا، پێچەوانەی ویستو خواستەکانی جەماوەرەکانیانو ڕای گشتی دەجوولێنەوە.

## سەرنجێك لە واقیعی ڕاگەیاندنی ئەمڕۆ و میدیای کوردیی

لە چەند لاپەڕەی پێشوودا، لەبارەی بایەخو گرنگی ڕاگەیاندن وەك فاکتەرێکی گرنگی هۆشیارکردنەوەو پێگەیاندنی کۆمەڵگاو ڕۆڵی لە بنیاتنانی سیستمی کۆمەڵایەتی و بوارەکانی تری ژیاندا، دواینو ڕوونمان کردەوە کە ڕاگەیاندن گەر بە شێوازێکی دروست و ئیجابییانە ئاراستە بکرێت گەورەترین خزمەتی پێدەکرێتو کۆمەڵگا بەرەو پێش دەبات.

لەگەڵ داننان بەوەدا کە بە فیعلی ڕاگەیاندن بە گشتی لە جیهانی ئەمڕۆدا توانیویەتی نەخشی ئیجابیو موسبەتی هەبێ، بەڵام لە زۆر ڕووەوە کارتێکردنی خراپی بووە و ئاسەواری سلبی لەنێو جەماوەرو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی دا جێهێشتووە، ئەمەش لەواقیعی ڕاگەیاندنی هاوچەرخدا هەستی پێدەکەین کە تەکنەلۆژیای ڕاگەیاندن بۆ هێندێ کاری نامرۆڤانە و فێڵو چەواشەکاری بەکاردەهێنرێ، وەك شێواندنی دیمانەو وتەو گوتاری کەسایەتییە ناسراوەکانو دروستکردنی وێنەی قەڵپو سڕینەوەی وێنەی کەسێك و دانانی وێنەی یەکێکی تر لە شوێنیا بۆ مەبەستی تایبەتی، هەڵبەستنی وتەو لێداون بە ناوی کەسێك، یان لایەنێك، یان سەرچاوەیەکی دیاریکراو بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان دوو کەس، یان لایەن، یاخود دەوڵەتەکان، دژایەتی کردنی ڕۆشنبیرو نووسەرانو کپکردنی دەنگە ڕەسەنەکانو هاندانی دەسەڵاتەکان بۆ تیرۆرکردن و پاکتاوکردنیان.

بە داخەوە دەڵێم کە دەزگا و کەناڵە ئیعلامییەکان بە گشتی و بە تایبەتیش لە جیهانی ئیسلامییدا، ڕۆڵێکی خراپ دەبینن لە ڕاکێشانی گەنجو لاوەکانمان بەرەو شت گەلێك کە

خزمەت بە ئێستاو دوارۆژیان ناکات، وەك جوانکردن و گەورەکردنی ئەدەبو رۆژسنبیری بێگانە، ناشیرینکردنی فەرهەنگو رۆشنبیری ئیسلامیی، و هەوڵدان بۆ لابردنی و نەهێشتنی لە سیستمی پەروەردەو فێرکردنیشدا، کە تەنانەت ئەو ئایەتانەش باس لە رێکخستنی خێزانو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو حوکمڕانی و جیهادو بەرخۆدان دەکەن، دەسڕێنەوەو وشەگەلی تر کە خزمەت بە رژێمەکانو سیستمە سیاسییە دەسەڵاتدارەکان بکات وەك (برایەتی، خۆشەویستی مرۆڤو ئاشتیو ...) لە شوێنیان دادەنرێن، گوایە ئەمە چارەسەری توندڕەوی و توندوتیژی دەکات!

هەروەها بڵاوکردنەوەی رۆشنبیرییەکی نادروستی جنسی، کە ئەمڕۆ لە کەناڵەکانی راگەیانداو لە میدیاکانی کوردیش بە داخەوە، ئەوینو خۆشەویستی و دڵداری ـ بە مانای پێوەندی نێوان ژن و پیاو ـ وەك بەهێزترین سۆز نمایش دەکرێت، بۆ ئەمەش ئافرەت وەك کاڵایەك بەکاردەهێنرێت، فیلمو زنجیرە دراما تەلەفزیۆنییەکانیش باس لە خۆشەویستیو هونەرو گۆرانی و پەیوەندی سێکسی ناشەرعی دەکەن، بێگوێدانە کاریگەرییەکانی لەسەر خێزانو مەترسی لەسەر تێکدانی قەڵای باوەڕو کلتوری کۆمەڵگا، کە بەم کارانە ئەخوازرێ تێڕوانینی ئیسلام بۆ رێکخستنی خێزانو جنس بشێوێنرێو بەرگێکی تری بە بەردا بکرێ و بگۆڕدرێ، گرنگی بە خورافاتو کەلووەکان و شتە نازانستییەکان دەدرێت.

لە راستیدا بوونی ئەو هەموو کەناڵە ئیعلامییە لە کوردستان بە کەناڵی ئاسمانیو رادیۆو تەلەفزیۆنی ناوخۆو دەرچوونی دەیان رۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەی حیزبیو سەربەخۆش، وە بەرەوپێشچوونی لە هەردوو رووی چەندێتیو چۆنیەتییەوە، نیشانەی زیندوێتی راگەیاندنی کوردییە و جێی دڵخۆشییە، ئازادییەکی باشیش گەر رێژەییش بێت فەراهەم هاتووە، بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کە ئازادی رەها لە هیچ شوێنێکی دونیادا نییەو ئازادی گرێدراوی بەرپرسیارێتییە، واتە لەگەڵ بوونی ئازادی ئیعلامیو رۆژنامەوانی دا، ئەبێ بەرپرسیارێتی ئەخلاقی لە بیرنەکرێ، دەبێت راگەیاندن پەیامێك بێت راستو واقیعی بۆ ئەوەی ئامانجی خۆی بپێکێت، بەڵام دەبینین ئازادی قۆزراوەتەوە زۆرجار بۆ تۆمەت پێکردنو ناوزڕاندنی خەڵکیو ناشیرینکردنو لێدانی ناسنامەی مسوڵمانێتی گەلی کوردستان، کە حاشا هەڵنەگرە کۆمەڵگای کوردیی کۆمەڵگایەکی مسوڵمانەو ئەو گەلە لە ریزی پێشەوەی گەلانی پابەندبوو بە ئیسلام دێتە ژمارو ئەو پەیامە بووەتە بەشێکی گرنگ لە ژیانی کۆمەڵایەتی، وەلێ مخابن هەوڵدەدرێ پێچەوانەی بیروباوەڕو ناسنامەی ئەو گەلە راگەیاندن

ئاراسته بکرێ و ئەمەش بێگومان ناواقیعی بوونی راگەیاندنی کوردیی لەو رووەوە دەردەخات.

پەیامی راگەیاندنی کوردیی، بە تایبەت لە سەرەتای لە دایکبوونی یەکەم رۆژنامەی کوردیی کە (کوردستان) بوو لە ساڵی (١٨٩٨)، ئەو پەیامە بوو کە گوزارشتی لە ناخی کۆمەڵگای کوردستان دەکرد، کە دەیەویست رۆڵەکانی گەلی کورد بەناوی خواو بە پشتبەستن بە فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) بەرەو پێش بباتو هۆشیاریان بکاتەوەو بایەخی خوێندنو خوێندەواری و دژایەتی کردنی نەزانینو دواکەوتنو رێگاکانی پێشکەوتنیان بۆ رۆشن بکاتەوە، واتە پەیامێك بوو پابەند بە بەها کۆمەڵایەتیو ئایینیو مرۆییەکانی گەلەکەمان، ئایا راگەیاندنو رۆژنامەگەریی کوردیی ئەمڕۆ میراتگری هەمان پەیامە کە (کوردستان) لە کۆتایی سەدەی (١٩)دا هەڵیگرتبوو؟ ئایا بە راستی دابڕینی راگەیاندن بە گشتی بە هەموو کەناڵەکانیەوە لە بەها ئایینیو کۆمەڵایەتیو کلتورییەکانمان و ئازادی رەهاو بێ قەیدو شەرت وەك هەندێك بانگەشەی بۆ دەکەنو بە گەورەتر سەیرکردنی کلتووری بێگانەو زەقکردنەوەی هەندێ هەڵەی مێژوویی، رێگای سەرکەوتن و گرەنتی پێشکەوتنمانە ؟!

بە دڵنیاییەوە، نەخێر، دەبێ راگەیاندن واقیعی کۆمەڵگاکەمان بەرجەستە بکات، نەك وێنەیەکی ناشیرین لەو کۆمەڵگایە پیشانی دەرەوە بەتایبەتی جیهانی ئیسلامی بدرێت، چونکە ئێمە هێشتا لە قۆناغی بنیاتنانەوەداینو لەم قۆناغەدا گرنگە دەزگاکانی راگەیاندنمان بەشدارییەکی بوێرانە و بە بڕشتانە بکەن لە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی کوردستانو بڵاوکردنەوەی چاکەو هەرچی لەبەرژەوەندی ئێستاو دوارۆژی میللەتدایەو خۆیان بپارێزن لە وروژاندنی ئەو شتانەی بە هۆیەوە نەوەکانی داهاتوو باجەکەی ئەدەن، دیارە ئەو ئیمکانیاتە زۆرەی میدیای کوردیی لێی بەرخورداره دەتوانرێ ـ لەتەك ناوەندەکانی تری پەروەردەو پێگەیاندندا ـ خزمەتگوزاری گەورە و شتی بە نرخ و سوودبەخش پێشکەش بە کوردستانو رۆشنبیری گەلەکەمان بکاتو هەنگاوی نوێو جددیش بەرەوپێش بنێ بەرەچاوکردنی ئایینو دابو نەریتی رەسەنی کوردەواریو بەخۆپاراستن و خۆبواردن لەو نموونە سلبیانەی لە شوێنانی تر تاقیکرانەوەو سەرکەوتوو نەبوونو دووبارە نەکردنەوەیان لێرە، بێ شکیش زیانەکانی راگەیاندن ئەگەر بەشێوەیەکی راستو دروست و هاوسەنگ بەکارنەهات،

زۆر زیانبەخشترو خراپترن لەو زیانو زەرەرانەی کە شەڕو شۆڕو تانكو تۆپو چەكە مرۆڤ کوژەکان دروستی دەکەن.

ئەمڕۆ دەکرێ راگەیاندنی کوردیی، رۆڵی بەرچاو ببینێ لە تێپەڕاندنی ئەم قۆناغە هەستیارەی گەلەکەمان و هەوڵدان بۆ دووچار نەبوونەوەی بە کارەساتو نەهامەتی تر، لە کاتێکا دۆستی زۆر کەمە، خوا لەگەڵیەتی چونکە ستەمدیدەیە، با ئەویش لە خۆمان نەرەنجێنین، سوپاس بۆ خودا تاڕادەیەکی باش دەروومان لێکراوەتەوە، نەبین بە بەشدار، راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، لەو شاڵاوەی دژ بە ئایینو کلتوری نەتەوەکەمان وەڕێخراوە، با راگەیاندن بەشداریی کاریگەرانە بکات لە چارەسەرکردنی گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان، لە بڵاوبوونەوەی چەندین دیاردەی نامۆو کوشندەی وەك بەکارهێنانی (مادده بێهۆشکەرەکان) کە گەنجەکانمان بەرەو چارەنووسێکی نادیار راپێچ دەکات، خۆ لێ نامۆبوونی گەنجانو سەری خۆهەڵگرتنو دوورکەوتنەوە لە هەر بەرپرسیارێتییەکی نیشتیمانیو نەتەوەیی، بڵاوبوونەوەی گەندەڵی کە ناوەندەکانی ئیعلامیی وڵاتەکەشمانی گرتۆتەوە.

درزێکی گەورە، ئەمڕۆ هەستی پێدەکرێ کە لە نێوان رۆشنبیرانو راگەیاندنکارانی وڵاتانی ناوچەکەی ئێمە بە وڵاتی خۆشمانەوە لە لایەكو جەماوەر بە تایبەت چینو توێژە هەژارەکان لەلایەکی ترەوە، بوونی هەیە، بۆیە دەڵێم پێویستیمان بە رۆشنبیریو راگەیاندنی ساغڵەم و دروست هەیە، بۆ ئەوەی بەرەنگاری نەزانینو دواکەوتن ببینەوە، رۆشنبیری مولتەزیم ئەتوانێ وەڵامگۆی ئەو داخوازییە بێتو بۆ ئەم جەنگە جەماوەر تەیارو ئامادە بکات.

پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان ئەوەی بوونی هەیە لەسەر زەمینی واقیعو ئەوەی دەمانەوێت، لە نێوان خواستو هیواکانو راستییەکان، تاوەکو بتوانین ئەوەی گەرەکمانە بەدی بێنین، ئەو فەرهەنگەی لەم بارودۆخەدا دەمانەوێتو زەروورە، بریتییە لە فەرهەنگی بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە، نەك فەرهەنگی رووخاندن و وێرانکردن، بریتییە لەو فەرهەنگەی سروودی (شوێنکەوتنی چاکترو جوانتر) دەچڕێ بێگوێدانە بێژەر، یان بکەرەکەی (**الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ..**).[1] واتە: ئەو کەسانەی گوێ لە قسەو ئاخاوتنان رادەدێرنو بەشوێن جوانترینو چاکترینیاندا دەچن.

---

[1] - (الزمر: ١٨).

مەرج نییە هەموومان وەکو یەك بیربکەینەوە، جیاوازی فیکریو کلتووری، جیابوونەوەو دەرچوون ناگەیەنێ لە کۆمەڵگەو خواستەکانی، چونکە ناکرێ بڵێین لە چوارچێوە مرۆڤایەتییەکەدا، ئەبێ گۆشەنیگامان و راوبۆچوونو خوێندنەوەمان بۆ شتەکان و رووداوەکان چوون یەك بێت، بەڵکو دەشێ راوبۆچوونەکان لەیەك جیاوازبنو خوێندنەوەشمان بۆ دیاردەو پەرەسەندنەکان وەك یەك نەبێ، بەڵام دەبێ پردی بەیەکگەیشتنو لە یەکبووردن ـ وەك رابردوو ـ لە رێی وتووێژو یەکتر خوێندنەوەوە، بەهێزو فراوانتر بکەین لە فەزای رۆشنبیریو ئیعلامیو کۆمەڵایەتیی-ماندا، بە لەخۆگرتنی رەگەزەکانی ئیختیلافو جیاوازی و پێکەوەکارکردن لە پێناو بنیاتنانی ئایندەیەکی باشتر لە کەشێکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری ئازادی وا کە رێز لە هەموو بیروڕاکان بگرێ و مافو کەرامەتو ئاینو دابو نەریتی گشتی کۆمەڵگاکەمانی تیادا پارێزراو بێت.

لە دووماهی ئەم نووسینەدا دەڵێین: پێویستە دەزگا و کەناڵە ئیعلامییەکانمان بە هەموو بەشەکانیانەوە بە رێگەی گەلدا گوزەر بکەن و هەڵگری بیروباوەڕو بەهاو خواستەکانی میللەتی خۆیان بنو هەوڵی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری تاكو کۆمەڵ بدەنو بۆ بەرژەوەندی گشتیو خزمەتکردنی وڵاتو پەروەردەی کۆمەڵگا و بنیاتنانی هاووڵاتی دڵسۆزو چاکخوازو خاوەن بیرو فەرهەنگی رەسەن کاربکەنو بە ئاراستەی سوودو بەرژوەندی ئێستاو دوارۆژی خاكو گەلو نیشتیمان تێبکۆشن.

## راسپاردەکان

نامانەوێ ئەوەی لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبەدا لێی دواین‌و روونمان کردەوە، لێرەدا دووبارەی بکەینەوە و درێژەی پێبدەین، ئەنجامگیریی‌و هەڵسەنگاندنی بۆ خوێنەرانی بەڕێز بەجێدێڵین، بەڵام پێمان باشە لە کۆتاییدا چەند پێشنیارو راسپاردەیەك بەشێوەیەکی کورت‌و گوشراو بخەینەڕوو:

١ـ سوودوەرگرتنی ئیجابیانە لە هەموو جۆرەکانی راگەیاندن‌و سەرجەم بەشەکانی بە بیسراوو بینراوو نووسراو و چاپکراوو هەر شێوازێکی ئیعلامی (وتووێژو دیالۆگ، وتار، شیعر و هەڵبەست ...).

٢ـ پێگەیاندنی کادیری کارامەو پسپۆڕ لە هەموو بوارەکان‌و ئاسانکاری لە تێگەیشتنی ئیعلامیی دا، بە کردنەوەی خولی تایبەت‌و ناردنی کەسانێك لەوانەی لە بواری راگەیاندندا ئیش دەکەن بۆ دەرەوەی وڵات، و خوێندن لە کۆلیژەکانی راگەیاندن لە ناوەوەو دەرەوەی هەرێمی کوردستان.

٣ـ خوێندنی (بابەتی راگەیاندن)ی نوێ و شێوازەکانی پەیوەندیکردنی جەماوەری لە کۆلیژەکانی شەریعەو خوێندنی ئیسلامیی دا، کە بکرێتە ماددەیەکی ئیلزامی و بخرێتە نێو پرۆگرامەکانی خوێندنەوە بە فەرمی وەك ماددەکانی تر کە تیایاندا ئەخوێنرێن، ئەمەش بۆ پێگەیاندنی کادیری ئیعلامی شارەزاو چالاك، هەروەها گرنگیدانی لایەنە پەیوەندیدارەکان بە تایبەت وەزارەتی ئەوقاف‌و یەکێتی زانایان بە پێگەیاندنی کادیری راگەیاندن لە مامۆستاو رێبەرە ئایینییەکان‌و ناردنیان بۆ دەرەوەی وڵات بۆ وەرگرتنی چەند خولێکی راگەیاندنی نوێ کە جەخت دەکات لە سەر گوتاری ناڕاستەوخۆ و بە پشتبەستن بە زیرەکی و لێهاتوویی و دەرخستنە نوێکان (إکتشافات) لەمەڕ ناخ‌و دەروونی مرۆڤ‌و عەقڵ‌و هۆشی و چۆنیەتی ئاراستەکردنی.

٤ـ بەکارهێنانی شێوازی هاسان‌و ساکاریی لە کاری راگەیاندن‌و زۆر رۆنەچوون لە ئەکادیمییەت‌و بەکارهێنانی دروشمگەلی کورت‌و ئاڵۆزو زاراوەی قورس، واتە بەشێوەیەك بێ گشت لا تێی بگەن.

٥ـ پلەبەندی لە کاری راگەیاندن‌و گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا، و نەوروژاندنی ئەو بابەت‌و مەسەلانەی هێشتا کاتیان نەهاتووە.

٦ـ هەروەك هەر وڵاتێك تایبەتمەندی خۆی هەیە لە هەموو ڕوویەكەوە، ئاوەهاش كوردستان تایبەتمەندی ئایینیو نەتەوەییو باكگراوەندی مێژوییو كلتووریو فەرهەنگی خۆی هەیەو پێویستە ڕەچاو بكرێ، لەگەڵ داكۆكی كردن لە ئازادیو ئازادی ڕاگەیاندنو ڕۆژنامەگەریی كە تەریب بێت لەگەڵ ئیلتیزام بە بەرپرسیارێتی گشتیو پێشكەشكردنی هەر شتێ لە ڕاگەیاندنی كوردییدا، كە سوودبەخشو ڕاستو واقیعی بێ، چونكە نە ئازادی ڕەهایەو نە بەرپرسیارێتیش بە مانای كۆتو بەندو ڕێگرتنە لە داهێنانی نوێو بڵاوكردنەوەی شتی بەسوود.

٧ـ هەوڵدان بۆ دروستكردنی ئاژانسێكی دەنگوباسی ئیسلامی لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی بە پسپۆڕیو شارەزاییەكی هونەریو زانستییەوە و بە دوور لە فشاری سیاسی حكومەتەكان، كە بتوانێ لە ئاست پێداویستیو داخوازیەكانی كۆمەڵگا ئیسلامییەكانو خواستی نەوەی نوێی مسوڵمانان دا بێت.

٨ـ دامەزراندنو پەرەپێدانی دەزگای بڵاوكردنەوەی ئیسلامیی بۆ چاپو بڵاوكردنەوەی كتێبو گۆڤارو بڵاوكراوەی هۆشیاریی هەمەچەشن كە كەسانی پسپۆڕو شارەزا لە بواری ڕاگەیاندندا كاری تێدا بكەن، هەروەها بوونی ڕاگەیاندنی ئیسلامیی سەربەخۆ بە پێویست دەزانم كە هەموو بوارەكانی ڕاگەیاندن بگرێتەوە.

٩ـ كاركردن بۆ گەیشتن بە گوتارێكی ڕاگەیاندنی سیاسی ئیسلامیی لە كوردستانو هاوكاریو هەماهەنگی لە نێوان ڕاگەیاندنی لایەنە ئیسلامییەكان و سوود وەرگرتن لە بەهرەو ئەزموونی یەكتریو بەسوودوەرگرتن لە تەكنەلۆژیای ڕاگەیاندنی نوێ.

١٠ـ هەوڵدان بۆ پێكهێنانی دەستەی ڕاوێژكارییو پلاندانان و پەرەپێدان بۆ كاروباری ڕاگەیاندنو سوودوەرگرتن لە خەڵكانی شارەزاو پسپۆڕو بەهەندوەرگرتنی ڕاو سەرنجو زانیارییەكانیان بۆ بەرەوپێشبردنو گەشەپێدانی كەناڵەكانی ڕاگەیاندن.

١١ـ پێویستە مزگەوت ڕۆڵێكی گەورەو شایستە ببینێ لە كایە سیاسییو كۆمەڵایەتییەكانو پرۆسەی پێگەیاندنی كۆمەڵایەتیدا، لە ڕێی وتاری هەینیو كارە تەوجیهییەكانی ترەوە، هەروەها بەرنامەگەلی ڕادیۆییو تەلەفزیۆنیو كەناڵی تر لە میدیای ڕەسمیی دا هەبێت كەپەیامی ئاراستەیی (تەوجیهی) فیكری ئیسلامیی بە جەماوەر بگەیەنێو بوار بدرێ بە مامۆستایانو بانگخوازانی سەر ڕاستی ئیسلامیی كە حەقیقەتی پەیامی ئیسلام بۆ خەڵك ڕوون بكەنەوەو لاوان بۆ ڕێگای چاك ئاراستە بكەنو هۆشیاریان

بکەنەوە لە لارێ بوونو کەوتنە داوی کاری خراپ و مادده بێهۆشکەرەکان، چونکە ئەو (ماوە ئایینی) یە کە لە هەندێ کەناڵ دانراوە، جگە لەوەی کە کەمە، نەیتوانیوە رۆڵی خۆیشی ببینێ، بە تایبەت کە ئەمڕۆ گرفتە دەروونیو کۆمەڵایەتییەکان روویان لە زیادبوونەو ئایین دەتوانێ باشترین هۆکار بێ بۆ چارەسەرکردنیانو پێگەیاندنی هاووڵاتی چاكو نیشتیمان پەروەرو دڵسۆز.

١٢ـ بوونی دەزگایەك یان لیژنەیەك زەروورە کە هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان تێیدا بەشداربن بۆ سەرپەرشتی و چاودێری کردنی هێنانو بازرگانی کردن بەو فیلمو کاسێتانەی وا خەریکە کۆمەڵگای کوردستان و بازاڕەکانمان داگیر دەکات و خەتەرێکی گەورە لەسەر پاشەڕۆژی لاوەکانمان دروست دەکات، بۆ پاراستنی وڵات لە بەزایەچوونو بڵاوبوونەوەی رەفتارو هەڵسوکەوتی نامۆو دوور لە بەهاو دابونەریتی رەسەنی کوردەواری و پاراستنی ئاسایشی ئەخلاقیی-مان.

١٣ـ خۆدوورگرتن لە ململانێو بەریەککەوتن لەگەڵ رای گشتییدا بە تایبەت لەو کاتانەدا کە لە لوتکەی هێزو توڕەییدایە...

١٤ـ بەرهەمهێنانی فیلمو زنجیرە درامای تەلەفزیۆنی و رادیۆیی ئامانجدارو تەرفیهی، کە دەکرێ بۆ ئەو مەبەستە گرێبەست لەگەڵ چەند کەناڵی TVو ئیعلامی شارەزادا ببەسترێت.

١٥ـ دەرفەت رەخساندن بۆ گەنجو لاوەکانمان بۆ گوزارشتکردن لە بیروڕاو خواستەکانیان لە دەزگاکانی راگەیاندنداو هاوبەشی پێکردنیان لە داڕشتنی بڕیاری ئیعلامیی دا، لەگەڵ دەرك کردن بەوە کە گوتاری ئیعلامی و رۆشنبیری ناتوانێ بە تەنیا بە کاری تێگەیاندن و پێگەیاندنی لاوان هەڵبستێو رۆشنبیری (مافی مرۆڤ) بڵاوبکاتەوە، بەڵکو ئەمە پێویستی بەمەنزوومەیەکی تەواو و رێكوپێك هەیە کە بەرەنگاری دیاردە نامۆکانو گەندەڵی ببێتەوە کە لە خێزانو قوتابخانەو زانکۆوە دەست پێدەکات، تا دەگاتە حیزبە سیاسییەکانو رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی سەربەخۆ، بۆ بنیاتنانو بەهێزکردنی رۆشنبیریو کلتووری مافی مرۆڤو رێزگرتن لە بەرامبەر، ئەمەش پێویستی بە دانانی بەرنامەو پلانی تۆکمەو زانستیانەی رۆشنبیریو ئیعلامی دەکات، هەروەك توێژینەوە ئیعلامییە هاوچەرخەکان جەختی لەسەر دەکەن.

١٦ـ چاكسازی له سیاسه‌تی گشتی بنیات نراو له‌سه‌ر هه‌ندێ چه‌مكی په‌یوه‌ندی كه ده‌كرێ بلێین هه‌ڵه‌و كێماسی تیایاندا هه‌ستی پێده‌كرێ، وه‌ك مه‌سه‌له‌ی پاشكۆیه‌تی راگه‌یاندن بۆ ده‌سه‌ڵاتی سیاسی‌و نه‌بوونی هاوسه‌نگی له گه‌یشتنی زانیاری‌و په‌یامه‌كانی راگه‌یاندن كه ئێستا له سه‌ره‌وه بۆ خواره‌وه‌یه، واته له (حكومه‌ت ـ حیزب) ه‌وه بۆ سه‌ر شه‌قام‌و خه‌ڵك، هه‌روا وه‌ك په‌یوه‌ندی هه‌ژموونی ده‌ره‌كی به‌سه‌ر كایه سیاسی‌و ئابووری‌و فه‌رهه‌نگییه‌كان‌و كاروباره‌كانی تری ناوخۆ، كه كاریگه‌ریی ده‌ره‌كی به‌هێزتره له كاریگه‌رییه ناوخۆییه‌كان.

بۆیه پێویسته راگه‌یاندن، له‌و سۆنگه‌یه‌وه كه په‌یوه‌ندی پته‌وی به سیاسه‌ته‌وه هه‌یه وه‌ك له به‌شی سێیه‌می ئه‌م كتێبه‌دا روونمان كرده‌وه، رۆڵی خۆی به‌شێوه‌یه‌كی ئه‌كتیڤ ببینێ و له پاشكۆیه‌تی ره‌ها رزگاری ببێ. بێگومان ناكرێ پێش بكه‌وین گه‌ر راگه‌یاندنێكی به‌هێزمان نه‌بێ، ناشكرێ راگه‌یاندن ئازاو بوێر بێ‌و وه‌ك پێویست رۆڵی ئیجابی ببینێ ئه‌گه‌ر خۆی له پاشكۆیه‌تی بێگانه‌و ته‌نیا چه‌پڵه‌لێدان بۆ حیزب‌و ده‌سه‌ڵات قوتار نه‌كات.

١٧ـ له كۆتاییدا، پێویسته هه‌موو راگه‌یاندنه‌كان له كوردستان به ئیسلامی‌و عه‌لمانی‌و نه‌ته‌وه‌ییه‌كانه‌وه، هاوكارو هه‌ماهه‌نگ بن له خاڵه هاوبه‌شه‌كان‌و كۆك بن له پاراستنی ده‌سكه‌وته‌كانی گه‌له‌كه‌مان‌و ره‌چاوكردنی به‌رژه‌وه‌ندی گشتی گه‌لی كوردستان و عێراق‌و قووڵ نه‌كردنه‌وه‌ی جیاوازییه‌كان.

# سەرچاوەکان

## یەکەم: سەرچاوە کوردییەکان:

### أ. کتێب:

١ـ ئیکرام کەریم حەمەئەمین: لە بنەما فیکرییەکانی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی، لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی لە کوردستان/ عێراق، ١٤٢١ك ـ ٢٠٠٠ز، (ناوی چاپخانەو ژمارەی چاپی بەسەرەوەنییە).

٢ـ برایمی مەلا: رۆژنامەگەری لە سەرەتای سەرهەڵدانەکانەوە تا چەرخی نوێکاری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨.

٣ـ رەئوف حەسەن: ئەلفاو بێتای رۆژنامەگەریی، چاپخانەو ئۆفسێتی روون، سلێمانی ١٩٩٩.

٤ـ د. فارِوق موحەممەد ئەبوزەید: سەرەتایەك لە زانستی رۆژنامەوانی، وەرگێڕانی فەرەیدون رەئوف عارف، چاپخانەی تیشك، سلێمانی،٢٠٠٦.

٥ـ محمد رشدی عبید: دەروازەیەك بۆ راگەیاندنی ئیسلامی، وەرگێرانی غازی ئیسماعیل مێروستەمەیی، چاپخانەی کاڵێ، چاپی یەکەم، ١٤٢١ك ـ ٢٠٠٠ز.

٦ـ هەژار، مامۆستا عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی: وەرگێڕاوی قورئانی پیرۆز، نشر إحسان، تاران.

٧ـ هەڤال ئەبوبەکر: راگەیاندنو راگەیاندنی کوردیی، ناوەندی رۆشنبیر، چاپی یەکەم، سلێمانی ،٢٠٠٢.

### ب. لێکۆڵینەوە و وتار:

٨ـ ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی: دەزگاکانی راگەیاندنو خواستی خەڵك، رۆژنامەی (یەکگرتوو) ژمارە (٣٤٩)، رۆژی ٢٠٠١/٨/٣.

٩ـ ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی: لە یادی کیمیابارانی هەڵەبجەدا.. باشترین ئەمەکداری لاکردنەوە لە زیندووەکانی و ڕاستکردنەوەی کەلاوەکانیەتی, ڕۆژنامەی (بزووتنەوەی ئیسلامیی), ژمارە (١٠٧)ی ڕۆژی ١٦/ ئازاری ٢٠٠٢ ز.

١٠ـ سۆزان مامە: ڕای گشتی و ڕۆڵی ڕاگەیاندن, گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس) سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ژمارە (٩), ٢٠٠٦.

١١ـ شاکار: واقیعی بوونی ڕاگەیاندنی ئیسلامی, گۆڤاری (سەبا) ـ گۆڤاری سەنتەری ڕۆشنبیری هیوا, ژمارە (١), هاوینی ٢٠٠١.

١٢ـ کۆژیر: چەند سەرنجێك لە ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا, ڕۆژنامەی (ڕاپەرین), ژمارە (١٢), ڕۆژی ١٩٩٨/٤/٢٠.

١٣ـ یاسین ئەحمەد عبدول: ڕاگەیاندنی ئیسلامی و ئەرکی مێژوویی, ڕۆژنامەی (ڕاپەرین), ژمارە (٢٠) ساڵی یەکەم, ١٩٩٨/٨/١٠.

## دووەم: سەرچاوە عەرەبییەکان:

### أ. کتێب:

١٤ـ قورئانی پیرۆز.

١٥ ـ ابراهيم اسماعيل: الإعلام الاسلامي ووسائل الإتصال الحديثة, (دعوة الحق) كتاب شهری يصدر عن قطاع الاعلام والثقافة برابطة العالم الإسلامي, العدد (١٣٣), السنة (١٣), مكة المكرمة, ١٤١٤هـ .

١٦ ـ تيسير محجوب الفتياني: مقومات رجل الاعلام الاسلامي, ط١, دار عمار, عمان, ١٤٠٨هـ ـ ١٩٨٧م.

١٧ ـ حسن الصفار: التغيير الثقافي أوّلاً, مؤسسة الوفاء, الطبعة الاولى, بيروت, لبنان, ١٤٠٥هـ ـ ١٩٨٥م.

١٨ ـ دكتورة حنان يوسف: الاعلام والسياسة مقاربة ارتباطية, أطلس للنشر والانتاج الاعلامي, ط٢، القاهرة, ٢٠٠٦.

١٩ ـ رعد كامل الحيالي: الاعلام الاسلامي الواقع والحقيقة, مطبعة الخلود، الطبعة الأولى, بغداد, ١٤١٤ هـ- ١٩٩٩ م.

٢٠ ـ رؤى في مسار العمل الاسلامي ـ إعداد مجموعة من الباحثين, اربيل ـ كوردستان العراق, ١٤٢٣ هـ ـ ٢٠٠٢ م, (لم يكتب محل ونوبات الطبع).

٢١ ـ فؤاد افرام البستاني, دار المشرق, ط ١٨, بيروت, (لم يكتب سنة الطبع).

٢٢ ـ الدكتور قحطان أحمد سليمان الحمداني: الاساس في العلوم السياسية, دار مجدلاوى للنشر والتوزيع, عمان, ٢٠٠٤.

٢٣ ـ السيد محمد تقي المدرسي: عن الاعلام والثقافة الرسالية, المركز الثقافي الاسلامي, الطبعة الأولى, (لم يكتب تأريخ الطبع).

٢٤ ـ الدكتور محمد سعيد رمضان البوطي: فقه السيره، انتشارات لقمان, ط١, قم, ١٣٦٩ هـ ش.

٢٥ ـ الدكتور محمد بن عبدالرحمن الحضيف: كيف تؤثر وسائل الاعلام؟ دراسة في النظريات والاساليب, مكتبة العبيكان, الطبعة الثانية, الرياض, ١٤١٩هـ ـ ١٩٩٨م.

٢٦ ـ محمد على الصابوني: صفوة التفاسير, دار القران الكريم, ج٢و ٣, بيروت (لم يكتب تأريخ ونوبات الطبع).

٢٧ ـ محمد محفوظ: الاصلاح السياسى والوحدة الوطنية, المركز الثقافي العربي, ط١, الدار البيضاء, ٢٠٠٤.

٢٨ ـ موسى زيد الكيلاني: الاعلام السياسي والاسلام, مؤسسة الرسالة, الطبعة الاولى, بيروت, ١٤٠٥هـ ـ ١٩٨٥م.

٢٩ ـ النووي, محي الدين يحي بن شرف النووي: رياض الصالحين, تحقيق عبدالله أحمد أبو زينة, مكتبة النهضة العربية (لم يكتب تأريخ الطبع).

٣٠ ـ الدكتور يوسف القرضاوي: الصحوة الاسلامية بين الجحود والتطرف, مؤسسة الرسالة, الطبعة الاولى, ١٤٠٥هـ ـ ١٩٨٥م.

### ب ـ لێكۆڵینەوەو وتار:

٣١ ـ أحمد ابراهيم الورتي: مصداقية الصحافة, الصحفي ـ نقابة صحفي كوردستان, العدد (١٧) انيسان ٢٠٠٦.

٣٢ ـ خالد بكر أيوب: الاعلام بين المصداقية والسبق, الصحفي, العدد (١٥) شباط ٢٠٠٦.

## سێیەم: سەرچاوەی فارسی:

٣٣ ـ حسن عميد: فرهنگ عميد, مؤسسه انشارات أمير كبير, چاپ بيست و ششم, تهران, ١٣٨٢ هـ ش.

## ناوەڕۆک


پێشەکی ........................................ ٥
**بەشی یەکەم**: بنەما گشتییەکانی ڕاگەیاندن ........................ ٧
چەمکی ڕاگەیاندن ........................................ ٧
پێناسەی ڕاگەیاندن لە ڕووی زمانەوانییەوە ........................ ٧
پێناسەی ڕاگەیاندن لە ڕووی زاراوەییەوە ........................ ٩
مێژووی ڕاگەیاندن ........................................ ١٣
پێکهاتەکانی ڕاگەیاندن ........................................ ١٨
بایەخو گرنگی ڕاگەیاندن ........................................ ٢٣
جۆرەکانی ڕاگەیاندن ........................................ ٢٦
بەشەکانی ڕاگەیاندن ........................................ ٢٧
چەمکی ڕاگەیاندنی ئیسلامیی ........................................ ٢٨
ڕاگەیاندن لە کوردستاندا ........................................ ٣٠
**بەشی دووەم**: ڕاگەیاندنی ئیسلامیی ........................................ ٣٣
ڕێخۆشکردنێك ........................................ ٣٣
گرنگی و بایەخی ڕاگەیاندن لە ئیسلامدا ........................ ٣٣
خەسڵەتو تایبەتمەندییەکانی ڕاگەیاندنی ئیسلامیی ........................ ٣٦
ئەرکەکانی ڕاگەیاندنی ئیسلامیی ........................................ ٤٤
بنەما شەرعییەکانی کاری ڕۆژنامەوانو پەیامنێر ........................ ٤٧
وتاربێژییو وتاری هەینی ........................................ ٥٤
یەکەم: وتاربێژیی ........................................ ٥٤
دووەم: وتاری هەینی ........................................ ٥٦
نامەو پەیام ........................................ ٥٨

راگەیاندنی ئیسلامیی لە کوردستاندا ........................ ٥٩
**بەشی سێیەم**: راگەیاندنو رۆڵو کاریگەرییەکانیو پێوەندی لەگەڵ سیاسەتو رای گشتییدا ........................................ ٦٣
پێوەندی نێوان راگەیاندن و سیاسەت ........................................ ٦٣
شێوازو کاریگەرییەکانی راگەیاندن ........................................ ٦٨
یەکەم: شێوازەکانی راگەیاندن ........................................ ٦٨
دووەم: کاریگەرییەکانی راگەیاندن ........................................ ٧٠
أ ـ کاریگەرییەکان ........................................ ٧١
ب ـ جۆرەکانی کاریگەریی ........................................ ٧٥
ج ـ مەرجەکانی کاریگەریی ........................................ ٧٩
د ـ بوارەکانی کاریگەریی ........................................ ٨٣
ڕای گشتیو راگەیاندن ........................................ ٨٤
چەمکی ڕای گشتی ........................................ ٨٤
گرنگی ڕای گشتی ........................................ ٨٦
جۆرەکانی ڕای گشتی ........................................ ٨٩
پێکهاتنی ڕای گشتی ........................................ ٨٩
کاریگەریی ڕاگەیاندن لە دروستبوونی ڕای گشتییدا ........................ ٩٠
هەڵسەنگاندنی ڕای گشتی ........................................ ٩٢
سەرنجێك لە واقیعی راگەیاندنی ئەمڕۆو میدیای کوردیی ........................ ٩٣
ڕاسپاردەکان ........................................ ٩٨
سەرچاوەکان ........................................ ١٠٢
ناوەڕۆك ........................................ ١٠٥

# بڵاوکراوەکانی پرۆژەی ( تیشك )

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێندنامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەکەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان "بەرگی سێیەم" | ن: فازل قەرەداغی |

| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
|---|---|---|
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام و سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددینا<br>پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |

| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
|---|---|---|
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ كتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ - ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |

| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
|---|---|---|
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی "بەرگی یەکەم" | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |